موکری

# سەگوەڕ

ڕۆمان

سەگوەڕ پێشکەشە بە:

شاعیری هێژا موئەیەد تەیب

ناوی کتێب: سەگوەڕ – ڕۆمان
نووسینی: موکری
بڵاوکراوەی ئاراس– ژمارە: ٨١٦
هەڵەگری: فەرهاد ئەکبەری + تریسکە ئەحمەد
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
چاپی شەشەم، هەولێر ٢٠٠٨
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە ١٦٦٤ی
ساڵی ٢٠٠٨ی دراوەتێ

# چیم لە بیر ماوە لەسەر سەگوەڕ

مام جەلال

چیرۆکنووسی گەورەی کورد، مامۆستا محەمەد موکریم بەهۆی سەگوەڕەوە باشتر ناسی، وەختێ کە لە دەست زوڵم و زۆر و ستەمی داگیرکەران ڕای کرد و خۆی گەیاندە برا شۆڕشگێڕەکانی خۆی، سەنگەری خەباتی ئەدەبیی خستە پاڵ سەنگەری پێشمەرگایەتی، هاتە ناوچەی ڕزگارکراوی ی.ن.ک.

بەش بەحاڵی خۆم، زۆرم پێ خۆش بوو کە ئەو ئەدیبە ڕووناکبیرە لایەنی ناوچەی "ی. ن. ک"ی هەڵبژاردووە و نیازیشی درێژەپێدانی خەباتی شۆڕشگێڕانەیە، تا بەئازادی قەڵەمە تیژەکەی بخاتە کار، هەر بۆیەش زۆرم پێ خۆش بوو کە ڕۆمانی سەگوەڕی بۆ چاپ و بڵاو کرایەوە.

بەڵام زۆری نەخایاند دەنگی تووڕەیی و نارەزایی لە نێو هەندێ کادیر و پێشمەرگەی "ی. ن. ک"دا دژی سەگوەڕ بەرز بووەوە و پرتە و بۆڵە لەملا و ئەولا پەیدا بوو.

لەو سەردەمەدا منیش، کە دەمێک بوو لە دڵ و دەروونی خۆمدا دروشمی (دابینکردنی ئازادی و ژیان)م بۆ نووسەران و



ئەدیبان خەملاندبوو، هەلەکەم قۆستەوە، بۆ چاکتر و بەدەنگ بەرزتر دەربڕینی دروشمەکە و بەرزترکردنەوەی ئالاکەی، بۆیە دەتوانین بڵێین هیچ نەبێ سەگوەڕ ئەو کەڵکەی هەبوو.

کەڵکی تری بڵاوکردنەوەی سەگوەڕ ئەوە بوو کە بووە مایەی قسە و باس و مشتومڕ و لێدوان و گفتوگۆ، ئەوەی ڕاستی بێ منیش بەشداریم تێدا کرد، هەم لەگەڵ پێشمەرگە نارازییەکان و هەم لەگەڵ کادیر و نووسەرانی "ی. ن. ک"یش ئەو ڕاستییەمان بۆ هەموان دووپات کردەوە، کە دەبێ ی. ن. ک هەڵگر و بەدیهێنەری دروشمی دابینکردنی ژیان بێت بۆ نووسەران و ئەدیبان، کەڵکە زۆر و زەوەندەکانی ئەو دروشمەم نیشان دان، لە وەڵامی هەندێ پێشمەرگەشدا پرسیم کە مامۆستا موکری چی تێ گرتوون؟ گوللە؟ یان گوتە...

گوتیان شتی وای نووسیوە بەدڵمان نییە دژی "ی. ن. ک"یشە
لە وەڵامدا گوتم:

دژی "ی. ن. ک"ی تێدا نییە، بەڵام گەر بەدڵتان نییە، بەهەمان چەکی مامۆستا موکری بەرەنگاری ببنەوە، ئێوەیش لەسەر سەگوەڕ بنووسن و چیتان پێ هەڵەیە نیشانی بدەن و چیتان پێ باشە دەری ببڕن.

ئەم ڕاستییەشم بۆ ڕوون کردنەوە کە مانا ڕاستەقینەکەی

ئازادی ئەوەیە بەسەربەستی و بێ ترس و لەرز، نووسەر بتوانێ بیر و بۆ چوونەکانی دەربڕێ، ئەمە مافی هەموو مرۆڤێکە، ئەوەی بەدڵی کاربەدەستان و حیزبەکانە، ئەوەی بەدڵیشیان نییە، بەڕەخنەی سازەند و ڕەخنە لەخۆ گرتن و دەستنیشانکردنی کەموکوڕی و ناتەواوییەکان و دەربڕینی ئاوات و خواستەکانیش، ئەگینا کام دیکتاتۆر زویر دەبێ لە مەدح و سەنا و پێ هەڵگوتن و شاباش بەسەر لێداندا؟ کە بەڕاستی ئەو جۆرە ڕەفتارە، هی چاوەشی سیاسییە نەک نووسەر و بیرڕووناک و ئەدیب و مرۆڤی سەرڕاست... هەموو حکوومەتە دیکتاتۆرەکان و کاربەدەستە زۆردار و دەستڕۆیشتووەکان و پۆڵدارەکان بۆ داپۆشینی زوڵم و زۆر و خیانەت و ڕاووڕووت و دزی و تاوانەکانی خۆیان، دەتوانن دەمی هەندێ نووسەر و خوێنەوار چەور بکەن و بەپوول و پارە ویژدانیان بمرێنن، یان بنوێنن و ناوبەناویش وایان لێ بکەن پێیاندا هەڵبدەن و درۆ و دەلەسەیان بۆ بڕازێننەوە. بەڵام ئەوانە ئازاد نین، بەڵکو چاوەشی سیاسی و چاوەشی ئەدەبین. ئازادی مافی پیرۆزی مرۆڤە، ئەدیبانی ڕاستەقینە هەمیشە دەبێ بۆ دەربڕینی ڕاستییەکان و بەرپەرچدانەوەی هەڵە و چەوتییەکان بکەونە کار. ئەمە مافێکی پیرۆزی هەموو ئینسانێکە کە حەق بۆ سوودی خەڵک و نیشتمان و مرۆڤایەتی و خودی ئینسان



بەکار بێنێت.

لە چاپکردنەوەی سەگوەڕیش چاکەیەکی تر دەبینم، ئەویش ئەوەیە، سات و سەردەمێکی شۆڕشە نوێیە پیرۆزەکەمان دێنێتەوە یاد و هانمان دەداتەوە بۆ بەکارهێنانی مافی پیرۆزی ئازادیی بیرورا و سەربەستیی باوەڕ و بۆچوون، بەو بۆنەیەشەوە دەمەوێ سەرلەنوێ داوا بکەمەوە لە:

١- ی. ن. ک و دەزگاکانی بۆ بەرزترکردنەوە و بووژاندنەوەی دروشمی (دابینکردنی ئازادی و ژیان بۆ نووسەران و ئەدیبان و بیرڕووناکان، بۆ بەدیهێنانی ئەو دروشمە و جێبەجێکردنیشی).

٢- نووسەر و ئەدیبانیش بۆ ئەوەی قەڵەمەکانیان تیژ بکەنەوە و بیریان جۆش دەنەوە، بۆ بەکارهێنانی گیروگرفتەکانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتووری و ئابووری و نیشتمانی و نەتەوایەتی و چینایەتی و خۆیییایەتی... بۆ ئەوەی بەوپەڕی سەربەستییەوە، ڕەخنە بگرن، کەموکورتییەکان دەستنیشان بکەن و چارەشیان بۆ دیاری بکەن، تاکو ڕەخنەکەیان ڕەخنەی سازدانەوە و داهێنەر و گەشەپێدەر بێت. وەک چاککردنەوەی نەخۆشەکە بەدیاریکردنی نەخۆشییەکە و دابینکردنی دەرمان، نەک بۆ مراندنی نەخۆشەکە...

١٩٩٨/٩/٨

ئەمشەو، نەخەوتی و بێدار بوویت، ئۆقرەت بەخۆت نەدەگرت، لەسەر پشت ڕادەکشای، هەڵدەستایتە سەرپێ، بەیەک شەقاو ژوورە تاریکەکەت پەی دەکرد، گاه دادەنیشتی و گاه سەرت دەخستە نێو ئەژنۆکانتەوە و پەنجەکانی دەستت هەڵدەپێکا، گاه سەرت بەرز دەکردەوە و خۆت بەخوێندنەوەی ئەو ڕستە بەزنجیر نووسراوانەی سەر دیوارەکانی ژوورەکەت خەریک دەکرد، کە بەر لە (تۆ) دەیان بگرە سەدان کەس ئەم ژوورەیان بینیوە و بەدوا سەرنجی پڕ لە سۆزەوە جێیان هێشتووە! (تۆیش) بەزنجیرەکانی دەست و پێت، هەندێ لە دیوارەکانیت نەخشاندووە! بەڵام نەک وەک کەسانی بەر لە خۆت، بەدروشمی



گیانبەخشی، نەبەزین و شیعری دڵتەزین، نا، ئەمانەت نەنووسیوە، بەڵکو بۆ نووسینی تاقە وشەکەت، چەند سەعاتێکی تەمەنت تەرخان کردبوو... تا، بەشێ لەو دروشم و شیعرانە، بەزنجیرەکانی دەست و پێت کوێر کەیتەوە. هەرگیز خۆشنووس نەبوویت، بەڵام بۆ نووسینی وشەکەت وەک خۆشنووسێ سەر و بۆرت بۆ پیتەکانی دادەنا و سێبەرت بۆیان ساز دەکرد. هەمیشە بەتەوسەوە سەرنجت دەدا، ڕەنگە کەسێکی بەختەوەر – پاش تۆ – ڕێی بکەوێتە ئەم ژوورە، گەلێ گاڵتەت پێ بکات و بەگەوج و گێلت بزانێ، بەکەسێکی بەزیو و بێ ورە لە قەڵەمت بدات، ڕەنگیشە ناحەقی نەبێ و تەنیا لە گۆشەیەکەوە سەرنجی ئەم وشەیەت بدات. وا بزانێ تەنیایی و ئازار، گێژ و سستی کردوویت و وا دێوانە ئاسا لەم ژوورەتدا ڕەفتارت کردووە... هەرکەسێ بێ، ناحەقی نییە، کەیفی خۆیەتی... تۆیش مەبەستت نییە، نەک ئەو کەسەی (پاش تۆ) دێتە ئەم ژوورە، تۆ ئاسا لە چاوەڕێکردنی چارەنووسی سەختی خۆیدا، سات بەسات وردە شانەکانی مێشکی، یەکدی بکوژن! بەبێ فەڕ و بێ ورەت بزانێ... بەڵکو دەربەستی ئەوە نیت هەموو مەردوم، چ ئازاد چ چەوساوە، بەئازا و چاونەترس و تێکۆشەر، یا بەخوێڕی و بێ کەڵک و بەدفەڕ و ترسنۆکت بزانن... تا (ئێستا) خۆت – کە نزیکترین کەسێکی لە خودی خۆتەوە بەدروستی نەتتوانیوە

دەستنیشانی خۆت بکەیت.

دەزانی، گەلێ جار ئازا و بەجەرگ بوویت، گەلێ جاریش ترسنۆک و بێ فەڕ، جار جاریش گەوجی و زیرەکی لە یەک کات و شوێندا بەسەریان کردووی...

(ئێستا) شەرم لە خۆت دەکەی گەر بڵێی ئازام، دڵیشت بەخۆت دەسووتێ گەر بڵێی ترسنۆکم!

تاقە شتێ، کە بێ سێ و دوو دەتوانی بەچپەوە بەخۆتی بڵێی ئەوەیە کە (ئێستا) لە مردن ناترسیت، ئەمیش (ڕەنگە) سەبارەت بەم جێیەت بێ... دووریش نییە تەنیایی کارێکی ئەوتۆی لێ کردبی، جۆرە ئەشقێکی سۆفییانەی سەیرت لەگەڵیا پەیدا کردووە وا بەسۆزەوە حەز بەجیابوونەوەی ڕۆح و جەستەت دەکەیت!! بۆ نەء؟ شەوانی شەو بەڕۆح دەژیایت و بەسەدان سەعات زیاتریش بەجەستە دەژیای تەنیا (ئاو... نان... خەوتن... ریتن) چی دی نا، بووبووە داوە نادیارییەکەی نێوانی جەستە و ڕۆحت.

(ئێستا) حەز دەکەی بەپەرۆشەوە جیایان کەنەوە، تا ڕۆحێکی تەنیای ئازادی بێ جەستەت، ئازادتر لە هەموو باڵندەیەکی کێوی لووتکە بەلووتکە هەڵفڕیت! جەستەی تەنیایشت نەک تەنیا ببێتە ئارامگای خەمی مردوو، یادی کەڵەک بوو، بەڵکو



ببێتە هێلانەی ملیۆنان کرم و میکرۆب، سەرئەنجامیش لە ژێر پێی کەساندا بێتە گەرد و بلەوتێتە قۆندەرە و کڵاش و سەر بەئاودەسخانە و مزگەوت و کەشتی و وڵاتانی دوور... دوور... بکات، گەردێکی ئەوتۆی بەلەسە، بلکێتە پۆستاڵ و لە بەندیخانەکاندا زەڕە زەڕە پەرت و بڵاو بێتەوە، تێکەڵی هەوا بێت و بچێتە نێو سیی (بەند و یاساوڵ و جەلادەکانەوە).

گرنگ ئەوەیە (ئێستا) ناترسیت!

دەشێ نەترسانیش جۆرێ بێ لە ترسنۆکی و هەنگاوی یەکەمی خۆ وەدەستەوەدان بێ... بەهەرحاڵ (ئێستا) خۆت چاکتری دەزانی بۆ ناترسیت! ئەوا ئەمڕۆ، هەر لە بەرەبەیانەوە لە نێو پیتەکانی وشە بەزنجیر نووسراوەکەتا دەتوێیتەوە، جڵەوی یادت شل کردووە و سەرکێشانە بەنێو دنیای یادەکانتا ئەمسەر و ئەوسەر دەکەی! دوێنێ، سەرلەئێوارە بوو، هەواڵیان پێ دایت (کە سبەی شەو فرمانی خنکاندنت وەجێ دێنن) بەلاتەوە ئاسایی بوو، کارێکی ئەوتۆی تێ نەکردی... بەبزەوە هەواڵەکەت وەرگرت... هیچت نەوت (ئەوان) پێیان وتی هەواڵیشمان بۆ دایکت ناردووە، تا بۆ دوا جار یەکدی ببینن...

زۆرت پێ سەیر بوو پێکەنینت بەخۆتا هاتەوە (هەر ئەمڕۆم لە ژیاندا ماوە! بۆ هەموو ڕۆژێکی ژیانم هەر دوا ڕۆژ نەبووە؟)

ئەم شەو، سەعات دوازدە فەرمانەکە وەجێ دێنن... خۆیشت نازانی بەپەلەیت یا ساتەکان چەقیون و ئەمڕۆت لێ ناگوزەرێت... چاوەڕێیت چاوەڕێیەکی گەلێ تەڵخ و قورس!

شەوێ... پاش هەواڵەکە، گەلێ یاد بەمێشکتا گوزەری کرد، هەندێکیان وەکو خەون دەهاتنەوە بیرت و هەندێکی دیشیان بەجۆرێ خۆیان دەئاخنییە بیرتەوە، هەموو وردە شتەکانیت وەدی دەکرد! بێزت لە هەندێ یاد دەهاتەوە، شانازیت بەهەندێکی دییانەوە دەکرد.

گەلێ یادی مردووت – کە بەخەونیش نەدەهاتنە بەرچاوت، زیندوو بوونەوە – چ یادێکی خۆشگوزەرانی بەسەری نەکردی... هەرکە بەئاستەم ساتێکی خۆشگوزەرانیت وەبیر هاتبا، یەکسەر پەردەیەکی ڕەشی یادێکی سەخت دای دەپۆشی. (ئێستا) نازانێ بۆ دەربەستی ئەم لەناوچوونەت نی! زوو... تەنیا ناوی مردن، ترسی دەخستە دەروونتەوە... (تۆ) خۆتت بە(بار) نەدەزانی و خۆتت بەشایستەی ئەم (ژیان و سەردەم و تافە) دەزانی کە زۆر شتی پووچ و بێ کەڵک و گەلێ بیری پیرۆزیشی لە ژێر پێدایە!

زیاتر دڵت بەوە خۆش بوو کە سەر بەنەتەوەیەکی فەرامۆشکراوی و لە وڵاتێکی پەناهەندەی چەند وڵاتێکدایت و



هەموو هەنگاو و هەناسەیەکت حیسابی بۆ دەکرێت... حیسابێ هەرگیز لێبووردن و بەخشین یا ستایش و جاویدی ناگرێتە خۆی!

گەلێ چێژت لە دەربەدەری و دەردەسەرییەکانی ژیان وەردەگرت، خۆتت هان دەدا بژیت و پلە پلە لە سەختییەکان بگەیت، بەرەو پیری هەموو ناهەموارییەکی دەچوویت، برسیەتی و کوێرەوەری بوونە مامۆستات و فێری ژیان ویستیان کردی و وانەی پیرۆزی و نەگریس – ژیان و مەرگیان– بۆ شی دەکردیەوە... نا... نەخێر (تۆ) هەرگیز خۆتت بە(بار) نەدەزانی.

(ئێستایش) نازانی، هۆی ئەم بێ دەربەستییەت لە ڕووی مەرگ و ژیاندا چییە؟ وەکو ئەوەی (ژیان) یا (مەرگ) پێوەندییان بەتۆوە نەبێ، یا ڕاستتر تۆ پێوەندیت بەوانەوە نەبێ، وەک ئەوەی بەتاقیکردنەوەی هەردووکیاندا تێپەڕی بیت!

شەوێ – پاش هەواڵەکە– یاد، مێشکتی تەنی بوو، بەرەو دوور دوور دوورتر، پەلکێشی دەکردی... بۆ پازدە ساڵ لەمەوبەر، بووە چاوساغت...

لەبەر بەفر بەجوانی چاوت نەیدەبینی، ئەو پێدەشتەی بەرپێت ڕەشاییی پێوە دیار نەبوو، چیاکانی بەرانبەریشت، ئەوەندە سپی بوون، ڕێشکە و پێشکەیان بەچاوانت دەکرد! زستانە

ڕۆژێکی سەخت بوو، دایکت بەڕێ دەخستەوە، سەرەڕای ئەوەی هەموو شتێ سپی دەچووەوە، کزەبایێکی ساردیش وەک تیغ خۆی دەکێشایە ڕوخسارتانەوە!

پازدە ساڵ تەمەنێکە و بەدەم ئاسانە. (ئێستا) هەموو شتێکی ئەو سەردەمەت وەبیر دێتەوە، بەزنجیرەکەی دەستت هەندێ لە دیوارەکەی ژوورەکەت هەڵکۆڵیوە... بەوشەی (سەگوەڕ) نەخشاندووت. ئەو وشەی پێوندییەکی بەتینی لەگەڵ باوەڕ و ڕۆحتدا پەیدا کردووە، بۆ نەء؟ ئەوە نییە گەلێ جار، بەمنگە منگ ئاوازت بۆ داناوە و تەنیایی خۆتی پێ دەلاوێنێتەوە و جار جارەش دەیبەستیتەوە بەوشەی (شەو، ڕێ، ونبوون) لە یەک دوو دێری بێ سەروبەر و بێ مانادا، جێت بۆ کردووەتەوە! هەرکە لە تاریکیی ژوورەکەت و لە تەنیایی، وەڕس دەبووی، بێ ئیرادە دەستت بەمنگە منگ دەکرد، تا ماندوو دەبوویت، زۆربەی شەوانت، خەوت نەدەهات، سەرت دەنایە قەد گۆشەیەکی ژوورەکەت... وشەی (سەگوەڕ) سەر زمانتی دەکردە هێلانە...

ئەو ئێوارە سەختەی پازدە ساڵ لەمەوبەر، بەچەند وشەیەکی بریندار، وەک ئەوەی دەروونت تووشی (خوێنرێژی) هاتبێ، دایکت بەڕێ خست، پێیت وت:

– دایکە، ئیتر، لێرەوە تۆ بڕۆ... خواحافیزت بێ... ئەو دێیەی



بەرانبەرت زۆر دوور نییە، هەر دە دەقیقە ڕێ دەبێ، لەوێشەوە سەیارە هەیە و بەئاسانی دەتباتەوە بۆ شار... من ناتوانم بێمە ناو دێ... ئاگات لێ بێ ئەو (نامە چکلێتانە) جوان قایم کە، جگە لە خاوەنەکانیان لە بیرت نەچێ نەیدەیتە دەست کەس.... خواحافیزت بێت! بەقوڕگی پڕ لە گریانەوە باوەشی پیا کردی و وتی:

– چاکە کوڕم، ئاگات لە خۆت بێ، سەرەڕۆیی نەکەیت، داویتمەتە دەستی (غەوسەوە) ئاگات لە خۆت بێ!

– لە پەنای تاوێرێکدا دانیشتی، چاوت بڕییە هەنگاوە شەکەت و قورسەکانی دایکتەوە، کە وەک تارمایی بەرەو دێ دەکشا... تۆیش تفەنگە چیکییەکەت نابووە باوەشتەوە... دەستی چەپیشت لەبەر تیشکە (خوێناوییەکەی) هەتاوی لەرز لێ نیشتوو، نابووە بەرچاوتەوە، تا دایکت گەیشتە نێو دێیەکە، دەستت لانەبرد... هەڵسایتە سەرپێ. ئەگەرچی زۆر ماندوو بوویت و گەلێ جار لە چەم و هەڵدێر و باریکەڕێی سەختا، دایکت لە کۆڵ دەگرت، بەڵام زۆر بەگورجی تاوی هەنگاوەکانی خۆتت دا، ترسی ئەوەت هەبوو شەوت لێ دابێ و ڕێ گوم کەیت! بەپەلە، هەر بەهەمان شوێن پێیەکانتان – کە بەسەر بەفرەکەدا چاپ بووبوون– کەوتیتە ڕێ... ئاگات لە ڕێ و

ماندووبوونی خۆت نەما لە نێو خەم و سۆزی دیدەنیی دایکتا توابوویتەوە... ساڵ وەختێ بوو نەتبینیبوو، کڵۆڵە خۆی وتەنی:

– بەهەزار دەردەسەری و جلشۆری و نانەواییی ماڵان، بەخێوم کردی! بۆ دیدەنیی (تۆ) شەو و ڕۆژی دابووە دەم یەکەوە، ئەم دێی بەهەنگاوی شەکەتی دەبەستەوە ئەو دێ، تا دۆزیتیەوە، دەست و پەنجەی لە گۆ چووبوو...

هەرکە لە دوورەوە چاوی پێت کەوت. بەجۆرێ بۆت هات و باوەشی پیا کردی، بەخوڕ فرمێسک لە چاوانیەوە دەهاتنە خوارێ، بەسۆزێکی زۆر سەیرەوە، ماچی دەکردی دەتیلێسییەوە و بۆنی پیا دەکردی! دامایت و شەرمت لە خۆت کرد، وات دەزانی وەک دایکت بەمنداڵت دەزانێ، لەوەولا هاوڕێکانیشت وەک منداڵێ سەیرت دەکەن! ئەگەرچی قوڕگت پڕ بووبوو و فرمێسک بەچاوانتەوە قەتیس مابوون، خۆتت گرت، لەباتی فرمێسک پێکەنینت پژاندە ڕوخساری دایکت! هەندێکیش شەرمەزار بوویت!

ساڵە وەختێ بوو چاوەڕێت دەکرد، نە هەواڵی دایک و باوک و خوشکەکەت دەزانی، نە ئەوانیش هەواڵی تۆیان دەزانی... لەو ماوەیدا هەر چاوەڕێت دەکرد، کاتت لێ بووبووە بەردە ئاشێکی قورس، نە فرمێسکت، نە هەناسەی ساردت، نەیاندەتوانی



بیگەڕێنن، بەجۆرێ چەقی بوو، ڕۆژی لێ نەدەگوزەری... لەپڕ، ئێوارە وەختێ، لەسەر ملەکەی بەرانبەری (بنکەکەتانەوە) لەگەڵ دوو هاوڕێتا، دایکت دەرکەوت... شێت ئاسا بەرەوپیریەوە چوویت، ئەویش سەرەڕای پیری، بەگورجییەوە بۆت هات.

دوێنی شەو، لە نێو ئەم یادانەتدا ون بووبووی... گەر ئێستا دایکت بێت، ناتوانێ بەرەوپیری بچیت و باوەشی پیا کەیت، ڕەنگە نەیەڵن زیاتر لە سەعاتێ چاوی پێت بکەوێ...

ئەوسا، سێ ڕۆژێ لەگەڵتا مایەوە، ئەو سێ شەو و ڕۆژە، هەتا بەرەبەیان پرسیارەکانت لە دایکت دووبارە دەکردەوە:

(– توخوا دایکە، باوکم چۆنە؟ گوڕێکی ماوە؟ ئەی نەسرینی خوشکم چۆنە؟ ئەرێ لەگەڵ دەرسەکانیا چۆنە، توخوا دایکە، خاڵۆ حەمە حەسەنم چۆنە؟ بشێ بەری نەدەن؟ خۆ ئەو بەستەزمانە، نەخوێندەوارە هیچی بەهیچەوە نەبوو... لە ڕەشبگرییەکەوە تا ئێستا بەر نەبووە؟ ها دایکە باسیانم بۆ بکە... دایکە، بەداخەوە بیستمان (ئەنوەر) ئیعدام کرا بەداخەوە... ئەرێ دایکە هاوڕێیەکانی شارم چۆنن؟ فەرەیدوون چۆنە؟ ئەو سەگە چاوشینە وەکو جاران ماوە؟ هەر قیتە قیت دەکات، باوەڕ ناکەم تا ژنێ نەهێنێ واز لە بەزم و ڕەزمەکەی بێنێ... ئەی مچە چۆنە، ئەویش وەکو جاران قسە زلەکانی ماوە؟

توخوا دایکە کە گەڕایتەوە، زۆر زۆر سەلامیان لێ بکە... چاویان ماچ دەکەم!

چاکە... گەر، ئەمڕۆ دایکت بینی، چی لێ دەپرسی؟ هەواڵی چ کەسێ؟ کام خزم و هاوڕێت؟ کێ؟ ... ها؟

( ئەوسا) دایکت لەبەر دڵی تۆ، بەجۆرە بزەیێکی خەمئامێزەوە دەیوت:

(– هەموو باشن... هەموویان سەلامت لێ دەکەن... نەسرین چاوەکانت ماچ دەکات...)

ئەو کاتە دایکت، قسەکانی بۆ تەواو نەدەکرا، دەیدایە پرمەی گریان، بۆت دەرکەوت شتێ ڕووی داوە و نایەوێ بۆتی باس کات! پەڵپت لێ گرت، پاڕایتەوە، هەر پێی دەوتی:

(– باوەڕت بێ، هیچ نەبووە... هەموو ساغ و سەلامەتن)

ئەو سێ ڕۆژە لەگەڵتا بوو، هیچی بۆ باس نەکردی... کەمی دەخوارد کەمتر دەنووست، دەگریا، تۆیش هەر سوێندت دەدا دەپاڕایتەوە، کەچی بێدەنگتر دەبوو، جار جارەیش دەیوت:

(– ئەمە فرمێسکی شادییە، قەت باوەڕم نەدەکرد بتبینمەوە... گەلێ هەواڵی جەرگبڕمان پێ دەگەیشت، هەموو ڕۆژێ دەیانوت فلانە شوێن بۆردوومان کراوە... فلانە شوێن بەر تالان کەوتووە



و زیندەوەری تیا دەرنەچووە... ڕۆحمان لەسەر دەستمان بوو... هەرکە دەسگیرتان لێ دەگیران، یەکسەر دەیانکوشت و تەرمەکانیان بەنێو شەقام و بازاڕدا دەگەڕاند و پاشان لە ناوەندی بازاڕدا هەڵیان دەواسین، هەموو جارێکیش بۆ سەیری تەرمەکان دەچووین نەوەک...)

تۆیش – لە ڕوویدا– خۆتت وا دەنواند کە باوەڕت بەم قسانەی هەیە! لە ناخیشەوە هەستت بەشتێکی نادیار دەکرد و لەرزی پیا دەهێنای، کەچی تا، نەکەوتنە ڕێ هیچی بۆ باس نەکردی... پاش ئەو سێ ڕۆژە بەڕێت خستەوە، خۆتت پێچایەوە، تفەنگەکەت هەڵگرت، لە هاوڕێیەکت پاڵتۆیەکی سەربازیت وەرگرت، داتە سەرشانی دایکتەوە، وردە وردە کەوتنە ڕێ، ئەگەرچی ئەو دێیەی سەیارەی بۆ دەهات سێ چوار سەعات ڕێ بوو کەچی ئێوە لە بەیانی سەعات حەوتەوە تا عەسر نەگەیشتنە نزیکی ئەو دێیە ئەویش سەبارەت بەو هەواڵە جەرگبڕە بوو کە لە ڕێدا پێی وتی، پاش تووڕەبوون و هەڵچوون وتت:

(– دە باشە دایکە، بۆ ئەم سێ ڕۆژە بێدەنگ بووی... بۆ... بۆ)

(– حەزم نەدەکرد دڵگیرت کەم... کوڕم ئەمری خوایە... وایان لە نێوچەواندا نووسرابوو و...)

سەرتاسەری ڕێ گێژ و کاس بوون، بەقورسییەوە بەڕێوە دەچوون، نەک دوودڵ بوویت و ماوەی سەرپشکبوونت نەبوو، بەڵکو هەر پێش ئەوەی هەواڵەکەت بداتێ، مەرجی خستە بەرت و دەستنیشانی هەڵوێستی کردی... پێی وتی:

(– بەشەرتێ پێت دەڵێم هەر چیم وت بەقسەم دەکەی!)

پەلەی بیستنت بوو، بەبێ ئاگاییەوە لەسەر یەک دەتوت:

(– بەڵێ... بەڵێ... شەرت بێ بەقسەت دەکەم!)

بەنەرمییەوە پێی وتی:

(– دە سوێندم بۆ بخۆ...)

(– بەخوا... بەسەری تۆ... بەقورعان... ئەوی تۆ بیڵێیت بەقسەت دەکەم!)

سووک دەستی گرتی، لە پەنای گا بەردێکدا، پاڵتۆکەی سەرشانی لەسەر بەفرەکەدا ڕاخست... دانیشتن، لەسەرەخۆ بەوپەڕی دان بەخۆگرتنەوە، کەوتە قسەکردن، سەرنجی لە ئاسۆ گیر کردبوو، بۆ دوور دەیڕوانی...

(– کوڕم، نامەوێ تۆیشم لە دەست بچی... نامەوێ بەهۆی منەوە... بگەڕێیتەوە بۆ شار!



(– دە قسە بکە دیقم کرد...)

(– بەکورتی، هەرکە تۆ هاتیتە دەرەوە، پاش چەند ڕۆژێ، هاتنە سەرمان هەموومانیان گرت... زۆریان لە باوکت دەکرد، کە بێتە دوات و بتهێنێتەوە... ئەویش دەیوت: ئێوە حکوومەتن، تۆپ و تەیارە و تانگتان هەیە... فەرموون بچن بیهێننە و... زۆریان لەگەڵا کرد و زیاتریان وت... هەڕەشەیان لێ دەکردین بماننێرنە ئەو خوارانە...

ئیتر پاش هەڕەشە، لە ژێر دارا کوشتیان، من و نەسرینیش...) هەرکە دایکت ناوی نەسرین–ی هێنا، دایە پرمەی گریان، تۆیش شێتانە، دەستی دایکتت ڕادەوشان و لەسەر یەک و بەپەلە دەتوت:

(– ئێ... ئێ... نەسرین... ئێ... چی؟)

من و نەسرینیان بەڕەڵلا کرد... هەر ئەو ڕۆژە بۆ ئێوارە نەسرین خۆی سووتاند... ئا کوڕم ئیتر خۆت دەزانی بۆ؟

شێتانە، هەڵسایتە سەرپێ، نەتزانی بۆ پەلاماری تفەنگەت دا، کەچی دایکت، سوێندەکەتی وەبیر هێنایەوە.

(– کوڕم، شەڕەف لە هەموو شتێ گرنگترە... ناڵێم پێم خۆش بوو نەسرین خۆی سووتاند... بەڵام پێم ناخۆش دەبوو بەو

شێوەیە ببینم... نامەوێ تۆ خۆت بەدبەخت کەیت...

مـــەترســـە کــوڕم، مـــەترســـە... نامـناسـی؟ دە ســاڵـی ڕەبەق بەنانەوایی و جلشـۆریی مـاڵان، تـۆ و نەسـرینم بەخـێو نەکـرد؟ کوڕم جـار جارەش پاکەتە جگەرەم بۆ باوکە کلۆڵەکەت دەنارده بەندیخـانە مــەترســە، بەئارەقی نێـوچاوان خـۆمم پێ بەخـێـو دەکرێ...).

دوا قسەی دایکت زیاتر لە هەواڵە جەرگبڕەکە کاریگەرتر بوو زیاتر کولانتییەوە ئەو ڕۆژە سەختانەی وەبیر هێنایتەوە کە تۆ و نەسرین تا ئێوارەی درەنگ چاوەڕێتان دەکرد، تا دایکت بەبارێ تەپوتۆز و ئاردەوە دەهـاتە مـاڵێ، بە سێ قـوڵی لەبـەر ڕۆشـنایی چرا کزەکەتان کسکۆڵەتان دەکرد... تا درەنگیش بەجووتە، تۆ و نەســرین پەڵپـتــان دەگـرت و داواتان دەکــرد حـیکایەتـی کــوڕە کەچەڵتان بۆ بگێڕێتەوە...

ئەوەندەی خەمی نەسرینت بوو، خەمی باوکت نەبوو...

زۆر کەم دەتبینی... خۆی وتەنی:

(– کەی هێـشـتـوویانە، چەن ڕۆژی لە نێوتانا بحەسـێمـەوە، هەر زیندان و فنیش و – نەفی– بەشم بووە...)

ئەو سەردەمە، ژیانی هەرسێکتـان، هەر چاوەڕێکردن بوو... لە



نێـو منداڵانیـشـدا نەتانـدەتوانی وەک منداڵانی دێ گـەمـە و یاری بکەن... لە ڕۆژێکدا دەیان جار پێیان دەوتی:

(– شـیـوعی کـوڕی شـیـوعی... تۆیش وەک باوکـە شـیـوعیـیـە سـەگبـابەکـەت خـایـەنی و مـەلیکت خـۆش ناوێ... بـاوکت هـەر بەسمێڵە قیتەکانیەوە دیاربوو کە...)

خۆ باوکە بەدبەختـەکەت هیـچی بەهیـچەوە نەبوو، پێوەندیی بەهیـچ ڕێکخـراوێکی سـیـاسـیـیـەوە نەبوو، نەخـوێنـدەوارێکی هـەندێ وریا بـوو، لە مـانـای ئیـمـپـریالیـست گـەیشـتـبـوو، جگە لەمـەش بەیتـە شـیـعـرێکی (هێمنی) کـردبووە بنێشـتـە خۆشـەی سـەر زاری لە هـەموو شوێنێکدا دووبارەی دەکردەوە:

«گـــەر لە برســـانا و لـەبەر بـێ بەرگـی ئـەمـــڕۆ ڕەق هـەڵێم، نۆکەریی بێگانە ناکەم، تا لە سەر عەردم ئەمن!»

بەهـەر جـۆر بـوو لەگـەڵ دایکتـا هەڵســـان و کـەوتنە ڕێ... بەســـەرنج یەکـدیتـــان دەدواند... ســـەرنجـەکـانت نەفــرەت و تووڕەبوونـی لـێ دەبـاری... ســـەرنجی دایکیـــشـت پاڕانـەوەی دەئاڵانە ڕوخسـاره ئاڵۆز و بێ ئۆقرەکـەت... خـواحـافـیـزیت لە دایکت کـرد و بەڕێت خـسـت... ئەو لەبەر دیدەنیی تـۆ نیـمـچـە هێمن و کـەیفخـۆش بوو، تۆیش لەبەر هەواڵە جەرگبڕەکە، کەیل و تووڕە بوویت!

خۆ ئەگەر ئەمڕۆ یەکدی ببینن، پێچەوانەی ئەوساتان لێ دێ... ئەو هەواڵی جەرگبڕی بیستووە... کە جێشت بێڵێ ئەو کەیل و تووڕە دەبێ... خۆ تەرمەکەیشت نادەنە دەستی تا جار جارێ بێتە سەر گۆڕەکەت کلۆڵیی خۆی و چارەنووسی (تۆ) بەچەند فرمێسکێکی گەرم بلاوێنێتەوە، لە شەو و ڕۆژێکدا دەیان جار بچێتە سەر گۆڕەکەت، وەکو زۆربەی ژنانی کوڕ کوژراو – گۆڕەکەت بڕازێنێتەوە... خۆ توانای ئەوەشی نییە (خێر ئاوێکت) بۆ دانێ! ئەو کەیل، تۆیش ئارام و بێ دەربەست، نیمچە کەیفخۆش، بەهێمنی و بێدەنگییەوە ڕوو لە بێدەنگییەکی هەمیشەیی دەکەیت... (ئەوسا) هەر دایکت بەڕێ خست و گەڕایتەوە، زۆر کەیل بوویت، ڕێت دایە بەر هەنگاوە تووڕەکانت، بەخوڕ فرمێسکیش لە چاوانتەوە دەهاتنە خوارێ... ڕەنگی بەفرەکەیش وەک دەست و پەنجەی پیرێژنێکی بێ کەس و تەماحکاری خاوەن تاقە مانگایێک فرمێسکەکانتی لە چاوانت دەدۆشی! لەگەڵ هەر تکە فرمێسکە و بڕیارێکت دەدا...

کەچی سوێندەکەت ڕێی وەئاکامهێنانی بڕیارەکانتی لێ دەگرتی... حەزت دەکرد بەڕۆژی نیوەڕۆ خۆت بگەیەنیتە شار، کوێرانە، هەرچی پیاوی میری هەیە بیاندەیتە بەر تفەنگ و تۆڵەی باوکت و نەسرین بکەیتەوە... خۆ ئەو کاتە وەکو (ئێستا)



نەبوویت، حەقت بوو بیری وا بکەیتەوە، کاڵفام و سەرەڕۆ بوویت...

سەعاتە ڕێیەک نەڕۆیشتبووی، لە نێو دنیای خەم و تووڕەبووندا، ون بوویت و ڕێشت ون کرد! گەرچی نانیشت نەخواردبوو، هەستت بەبرسییەتی نەدەکرد... لە پاینی چیا سەختەکەوە بەرەو شیوە بەرینەکەدا کشایت، هێشتا خۆر ئاوا نەبووبوو، سێبەری چیاکان دۆڵەکەی تاریک کردبوو... بەپەلە تاوی هەنگاوەکانی خۆتت دەدا... لەگەڵ هەر هەنگاو هەڵهێنانێکدا تف و جنێوێکی مزرت بۆ بێ بەزەیی و زوڵم و زۆری میری و دەس و دایەرەکانی دەنارد... بەنیمچە دەنگێکی بیستراو خۆتت دەدواند...

نەسرین و باوکت لە نێو دیدە و مێشکتا ئۆقرەیان گرتبوو، خۆتت لە ئاستی ڕۆحی ئەو دوو بێ تاوانەدا بەتاوانبار دەزانی، بووبوویتە هۆی لەناوچوونیان، چەندان جۆر دەنگی تێکەڵ لە نێو سەرتا دەزرنگایەوە... دەنگی قیژە و پاڕانەوە بێ سوودەکەی (نەسرین) کە بەهەشت نۆ (کەتەی ملهوڕەوە) تێی بەر بووبوون، تێکەڵی دەنگی خەمێکی بێ ئەندازەی دایکت بوو – لە ژوورێکی نزیکەوە گوێی لە دەنگی نەسرین دەبوو! هەرچی تەلی تووڕەیی و ڕقت هەبوو بەم دەنگانە دەلەرینەوە... دەنگی جنێو و بێ

دەربەستیی باوکت، تێکەڵ بەدەنگی قامچی و داری سەرپشت و سنگی دەبوو! هەمــوو ئەم دەنگانە لەگەڵ کزە با ساردەکەدا، ڕوخسارتی تیغ ئاسا شەق دەکرد و کاسی کردبووی...

ئەو ئێوارەیە بەو سەرمایە، ئاگرەکەی لەشی نەسرین، لە نووکی پەنجەی پێتەوە، بۆ تەوقی سەرت دەچوو... دەستت بەسەر سنگ و پشتی خۆتا دەهێنا، ئەو کێبڵ و دارانەی لە باوکت دەدرا بەسەر لەشی تۆیشدا، وێنەی خۆیان نەخشاندبوو... دیمەنی دایکە بێ کەسەکەت بەرچاوی لێڵ کردی... کوێرانە، بەهەڵدێر و نشێوەکاندا شۆڕ دەبوویتەوە.

شەوێ... نەک وەک خەو بەڵکو وەک ئەوەی تازە ڕووی دابێ، لە نێو ئەو شەو و بەفرەدا لەترت دەدا... پازدە ساڵ بەدەم ئاسانە!! ئێستایش وردە شتەکانی ئەو شەوەت وەبیر دێ و لە بەرچاوتا سەما دەکەن!

ئەو کاتە بەگوڕ بوویت و هێزی جوانەگاییێکت هەبوو! ئێستا هەندێ پیر و بێ هێزی، کەچی بەڕۆح و باوەڕ هەزار جار ئەوەندەی ئەوسا بەهێزی.

ئەوسا، بەهێز بووی، چاونەترس و بەجەرگ بووی، هەندێ جاریش دەترسای، ئێستا – ئەگەرچی – تەنگەنەفەسی بووەتە هاودەمت، هەندێ جاریش بەرچاوت تاریک دەبێ و خۆتت



بەپێوە بۆ ناگیرێ، بەڵام لە هیچ شتێ ناترسی... تەنانەت لە خۆیشت ناترسی! جاران، لە خۆت، لە سەرکێشی و سەرەڕۆییت زۆر دەترسای، کەچی ئێستا ئەو – خووانەت – کەوی کردووە و دەستەمۆ بوون... زوو... دەبوویتە دوژمنێکی کەللەڕەقی خۆت، کەچی ئێستا دۆست و ئاشنان! ئەو کاتە خەمت زۆر بوو، لەزەتت لە خەمەکانت وەرنەدەگرت، تووڕە دەبووی و خۆتت هان دەدا تۆڵەسێن بیت!

ئێستا هەموو وردە خەمێکت جۆرە لەزەتێکی بە تەمەنی هەیە! حەز دەکەی لە کاتی وەبیرهاتنەوەتدا، تەمەنی ئەو خەمانەت درێژ کەیت! تا زیاتر قاڵ بیت و خۆت لە ئاستیاندا وەک قوتابییەکی گوێڕایەڵ ببینی و سەرنج بدەی، گوێ هەڵخەیت... ئێستا نەک بیری تۆڵەسەندن بەمێشکتا گوزەر ناکات، بەڵکو لە خوای خۆت دەپاڕێیتەوە، ئەزیەتی ئەو کەسانەش نەدات وا ئەزیەتی ڕۆحی تۆیان داوە... ئێستا وەکو جاران نیت، جاران بەدوای خوادا دەگەڕای و خۆتت دەبینی، ئێستە بەدوای خۆتتا دەگەڕێیت و خوا بەدی دەکەیت، لە نێو هەموو شتێکدا بەدیی دەکەیت و تەنانەت لە نێو ڕۆحی ژانگرتوو و جەستەی ئەزیەتکێشی ئەو کەسانەی – هەشت نۆ سەعاتی تر – گوریسەک دەخەنە ملتەوە!

ناتەوێ و نەفرەت دەکەیت لەوەی کەسێ لە خوا داوای ئەزیەتی کەسانی دی بکات. ناتەوێ، هەرگیز، خوا ئەزیەتی هیچ کەسێ بدات تەنانەت ئەزیەتی شەیتانیش، چونکە لە نێو هەموو پاک و پیسێکدایە و ناتەوێ خوا خۆی ئەزیەت بدات... ئەوانەی ئەزیەتیان داویت، نەفام و ئامێر و بەدبەخت بوون! (ئێستا) گەر لە ئەوپەڕی دەسەڵاتدا بی، بێنە بەردەستت دەیانبەخشی! (ئەوسا) لە شەوێکی تاریک و لە نێو بەفردا گیرت خواردبوو، توانات هەبوایە مەودا بۆ هەنگاوەکانت هەبوو، تفەنگیشت پێ بوو... هەندێ دەترسای و لە تارماییەکان سڵت دەکردەوە، (ئێستا) لە نێو ئەم ژوورە چکۆڵە و پیس و تاریکەدا، دەست و پێت لە زنجیردایە و مەودای هەنگاوەکانت سێ چوار شەقاوە و ناتوانی– لەبەر نزمیی ژوورەکەت – بەتەواوی بەپێوە بوەستی... (ئا لێرەدا) تەنیا ترس نەبێ بیر لە هەموو شتێ دەکەیتەوە...

ئەو شەوە ڕێت ون کرد، ئێستا سەری گلۆڵەی ڕێییە ئاڵۆزەکانی تەمەنی خۆتت بەدەستەوەیە. ئەو شەوە گەلێ شتت لێ بووبووە تارمایی و جووڵە و دەنگیان پەیدا کردبوو. ئێستا خۆت لە نێو چاوەڕوانی و بێهوودەیی (ترس و بەجەرگی، دیلی و سەربەستی، ڕاستی و ناڕاستیا) بوویت بەتارمایی... ئەو



شەوە لە نێو چەمە چڕ و بەرینەکەدا کوێرانە دەسووڕایتەوە، ئاو لە چاوانت دادەهات، ئارەقت دەردەدا، بەپەلە بوویت (ئێستا) تاقە فرمێسکێ لە ناختا نەماوەتەوە، ڕاستەڕێیەکی بێ گرێی ژیان لە بەرپێتا چاوەڕێیە بەقۆندەرەکانت ماچی کەیت، بڵێسەی دوا هیوات لە بەرچاوتا دەدرەوشێتەوە و ڕۆشناییی بەخشیوەتە زۆر شتی نادیاری، گەلێ شتی جوان و زۆر شت بەڕووتی دەبینی هەموو دەقیقەیێکی ئەم (کورتە تەمەنەت)! وردە گوناهەکانی ڕۆحت، بەلەشتەوە هەڵدەوەرێنێ و دەکەونە بەرپێت و لەشت سووک دەبێتەوە! ئەو شەوە هەرکە پەلەوەرێ لە بەرپێتدا هەڵدەفڕی، لەرزێکی سارد لە نووکی پەنجەی پێتەوە بۆ تەوقی سەرت مێروولەی دەکرد، ئارەق بەلەشتەوە دەمەیی و بۆ چەند ساتێ دەحەپەسای، پاشان هەر بەئومێدی ڕێ دۆزینەوە دەکەوتیتەوە گوڕ... وردە وردە سەرما کاری تێ کردی، لە دوورەوە ڕۆشناییەکت بینی، دڵت خۆش بوو... (ئێستا دڵخۆشتری، ڕۆشناییەک لە دەروونتایە هەرگیز کز نابێ و ناکوژێتەوە، کاتێ گوریسەکە دەنێنە ملتەوە – بەجۆرێ ئەو ڕۆشناییە دەگەشێتەوە هەرچی کونج و کەلەبەری تاریک و شێداری دڵ و مێشکت هەیە ڕۆشنی دەکاتەوە و تاقە فرسەتێکی تەمەنتە هەموو شت و ڕەنگەکان بەقەد و قەوارە ڕاستەقینەکەی خۆیانەوە دەبینی!

(ئەو شەوە) بەرەو ڕۆشناییەکە بەپەلە لەسەر بەرزاییەکانەوە خۆتت غلەوە کرد، هەرکە نێزیک بوویتەوە، حەپەسای... نە ڕۆشنایی هەبوو نە هیچ شتێ!

چەند جارێ چاوانی خۆتت هەڵگڵۆفی... چاوت ڕێشکە و پێشکەی دەکرد... کەچی (ئێستا) بێ ئەوەی دەستی بۆ ببەی بەئاسانی ڕۆشناییەکەی دەروونت خۆی دێتە دەستەوە... گەمەی لەگەڵدا دەکەی... چاوی دەروونت هەموو شتێکی دەبینێ... دیوارە ئەستوورەکانیش دەسمێ بەرەو دەرەوە... دەرەوەی ژوورەکەت، بۆ شار، وڵاتانی دی، بیابان، دەریا، چیا... گەورە و بچووک، پووچی و بەکەڵکی، پیرۆزی و نەگریسی، زۆر شتی بینراو و نەبینراو بەدی دەکەیت، تەنانەت ناخی یاساوڵەکانی ئەم بەندیخانەیەت دەسمی و دەروونیان دەخوێنیتەوە، لە خەم و ئازاریان دەگەی، کە چۆن، تەنیا لە پێناوی نانی ژیاندا بوونەتە ئامێر... تێ دەگەن و دەزانن و نان بەرچاویانی گرتووە... دەزانن ناڕەوایە... هەموو ڕۆژێ پەلی چەند کەسێکی تۆ ئاسا دەگرن، یەک دەیداتە دەستی ئەوی دییەوە، تا گوریسەکەی لە مل دەنێن، وەک ئامێر دەجووڵێنەوە، بەیەکدیی دەسپێرن، فرمێسکەکانی ناخیان دەبینی، هەست بەگەرمی و تەڕایەتییان دەکەی... لە مواجەهەی پێش ئیعدامی



کەسێکدا (ئەمان) وەک (چاو) دەیانبینی، دەگرین، گریانێکی گەلێ بەسۆز و بێدەنگ بۆ خۆیان و ئیعدامکراو و کەسوکارەکەی! زیاتر بۆ خۆیان و ماڵ و منداڵەکانی خۆیان دەگرین... تۆ چاکتر دەزانی بۆچی دەگرین... بێ دەسەڵاتیی خۆیان دەلاوێننەوە ئەم جۆرە فرمێسکەش دەکەنە نمەکی نانی (ژیانیان).

***

ئەو شەوە... جارێکی دی لەسەر بەرزییەکی دییەوە، چەن ڕۆشناییەکی دیت بەدی کرد، هەستت کرد و تێی ڕامای و لەبەر خۆتەوە وتت ئۆخەی ڕزگارم بوو! (شەوێ) هەرکە هەواڵی جێبەجێکردنی فرمانەکەیان پێ دایت وتت ئۆخەی ڕزگارم بوو!

ئەم دوو (ئۆخەیەت) گەرچی لە یەک دەم و زمانەوە هاتوونەتە دەر، بەڵام یەکیان بێ بۆنە و ئەوی دییان بۆندارە! یەکەمیان لەبەر ترس و بێزاربوون و خۆ بەتۆڵەسێنزان و بەرەو (ئاوایی) چوون بووە. دووەمیان لەبەر بێ ترسی و ئارەزووی ژیانویستی و بەخشندەییی ڕوو لە بێدەنگیکردنە.

ئەو شەوە، لەبەر خۆتەوە دەتوت، (ئەوە ئاوەدانییە) یەکە یەکە ڕۆشناییەکانت دەژمارد، پێنج شەشێ بوون دووکەڵی سۆپای ماڵەکانیشت دەبینی، بەکەیفخۆشییەوە لەسەر ملەکەوە شۆڕ

بوویتەوە خواریّ، نزیک بوویتەوە... حەپەسای ئەمجارەشیان هەموو شتێ لە بەرچاوت ون بوو، لە زەوییەکی خاڵ خاڵ بەولاوە هیچ شتێکی دیت نەدەبینی... ئەویش هەندێ گابەرد بوون و بەفرەکەی سەریان توابووەوە و ترسای! ترس هەموو شتێکی لێ گۆڕی بوویت... (ئێستا) نە ترسان هەموو شتێکی بۆت ڕوون کردووەتەوە... ناخ و ناخی بەدی دەکەیت! ئەوسا لەبەر ترس گومانت لە چاوانی خۆت پەیدا کرد... نەتدەوێرا بیسمیللا بکەی و شایتمان بێنی... دە ڕۆژێ لەوەوبەر بوو شەیتانی بووی لەبەر سەرما نەتدەوێرا مەلە بکەیت! (ئێستا) چەند مانگێکە جگە لە دۆلکەیەکی ئاوی گەرمی خواردنەوە، چاوت ئاوی نەبینیوە... گەلێ لەشپاکی، ئەگەرچی هەموو شەوێ خەونی پیرۆز بەسنگ و مەمکی دڵخوازە (لە دەستچووەکەتەوە) دەبینی و شایەتمان بەخۆتا دەهێنێ و خۆت بەهەق دەزانی نوێژ بۆ پەرستنی خۆت دەکەی! دڵت دەردەکەی و دەیکەیتە میحراب و کڕنۆشی بۆ دەبەیت!

ئەو شەوە، بێزت لە خۆت دەکردەوە، بەدۆڵە پێچاوپێچەکەدا، بەنێو ئاوی چەمەکەدا بەپەلەتر دەڕۆیشتی، هەزاران دەنگی ناجۆر لە گوێیەکانتا دەزرنگانەوە... لەپڕ لات کردەوە، دەعبایەکی درێژ و سەیر بەژوورسەرتەوە ڕەپ ڕاوەستابوو! لە





هەزاریەکی ساتێ کەمتر، خۆت دایە سەر زەوی و بەهاوارێکی ترسئامێزەوە گوللەیەکت تێ گرت، ئەوەندەی تر قەوارەی کولێرەیەک ئاگرت لەسەر سنگی – دەعبا –کە هەڵسان و بۆ چەند ساتێ تەقەی گوللەکە لە مێشکتا دەنگی دەدایەوە و جۆرە زیکە زیکێ سەرتاپای لەشتی گرتەوە، بۆ سێ چوار دەقیقەیێک چەقیبوویتە سەر زەوییەکە و نیوەگیان بووی... دەنگی (سەگوەڕ) بەئاستەم و لە دوورەوە وەڵامی تەقەکەیان دایەوە... ئەم دەنگە! ئەم (سەگوەڕە) هێناتیەوە سەر خۆ، دڵنیا بوویتەوە کە لە نێو دنیای (مادی)دا دەژیت، سووکە ئومێدێکی کز گوڕی پێ بەخشیت و هەڵسایتە سەرپێ – دەنگی سەگوەڕە دوورەکە – لە کزبووندا بوو – خۆتت نزیکی دەعباکە کردەوە، سەرنجی جێ گوللەکەتت دا، سەرت سوڕما، تەمەس کێلە قەبرێکی بەرزت پێکاوە!

ئێستا بێ گوللە و بریندارکردنی هیچ کێلە قەبرێ، بەسەرنجی تیژت بلاچە، نەک لە کێلە قەبر، بەڵکو لە تاریکیی سفت و گەنیوی – نێو قەبرستانی دەروونت هەڵدەسێنێ و مردووانی هاوڕێی (مرۆڤت) لە هەر ڕەنگ و زمان و نەژادێک، لە هەر بەرەی مرۆڤ ویستی مرۆڤکوژیدا بن، لە ناخی خۆتا وەئاگایان دێنێ و دەیاندوێنێ، تۆ... بەڵێ تۆ... ناخت

گۆڕستانێکی جیهانی مەزنە! گوێیان بۆ هەڵدەخەیت و لێیان تێ دەگەی، ئەوانیش بەو سرووده هەمیشە جاویدانەیان بێهودەیی ژیان و نەترسان لە مەرگ دەکەنە مارسلیز و دەیپژێننە سەر هۆشتەوە ئاشنایەتی و خۆشەویستیت – پاش بیستنی ئەو سرووده – لەگەڵیاندا بەتینتر دەبێ و لە خۆتیان جیا ناکەیتەوە، کەسێکیانیش تۆ بەغەریب نازانێ...

تۆ و ئەوان و ئەوان و تۆ، لە دەروونی خۆتدا، کۆی بیری ڕەسەنی فەیلەسووف و پێغەمبەران و تێکۆشەرانی هەمیشە بەوەفا و لەخۆ بوردووانی سەرتاسەری مێژووی پەیدا بوون و ئێستای بریندار و سبەینێی (تۆپیوون)!

ئەو شەوە دەستت بەسنگی کێلە بریندارەکەدا دەهێنا، وەک ئەوەی خۆت بریندار بوویت، ئێش هەموو لەشتی بەسەر کردبوو... دەترسای! (ئێستا) پڕ بەدڵ حەز بەکێلێکی ئاوها بۆ قەبرەکەت دەکەی. نا لە تاریکە شەوێکدا ڕێبوارێکی ڕێ لێ ونبوو بینینی، بەسۆزەوە سروودی (نەترسانی) بۆ بکەیتە دەنگی ئەو بێدەنگییەی تیایدا ون بوو... گەر ونبوویش، خۆت ئاسا سەرکێش و بێ حەوسەڵە بوو، لێت هاتە دەس و گوللەی پێوە نای، ئەوا ئاگر و جێی گوللەی کێلەکەتی بۆ بکەیتە چرا و بیدەیتە دەسی... خۆ ئەگەر – پاش تەقەکەی – دەنگی هیچ



سەگوەڕێ، لە هیچ لایەکەوە بەرز نەبووەوە، ئەوا هەرچی چرپە بزەی بەسۆزت هەبووە... هەرچی ناڵە و ئازار و دەردت هەبووە، ئەم دەنگانەی بۆ تێکەڵ کەیت و بیکەیتە (وەڕینێ) بەرەو دنیای ژیانی پڕ تەلیسماویی ڕێنوێنی بکەیت... ئەو شەوە... هەرکە دەنگی سەگوەڕەکە – کپ و خامۆش بووەوە، تەقەیەکی دیت بۆ ئاسمانی سەگوەڕەکە هەواڵە کرد... ئەمجارەیان (سەگوەڕ) نەک تەنیا ئومێدی ژیانی پێ بەخشیت، بەڵکو هەنگاوەکانتی بەرەو لای خۆی پەلکێش کرد!

لێرە – لە نێو ئەم ژوورە تاریکەت – گەلێ شەو، لە نێو تاریکیی یادەکانت و داهاتووی نادیارتدا، ون دەبووی! زڕەی زنجیری دەست و پێی ئەو هاوڕێیانەت کە فەرمانی ئیعدامکردنیان، جێبەجێ دەکرا، تێکەڵی ترپەترپی پێی پۆستاڵی یاساوڵەکان دەبوو – کە لە نزیکی ژوورەکەی تۆوە پەلکێشیان دەکردن – ئەو دوو دەنگە تێکەڵ دەبوون، لە جۆری هەمان دەنگی (سەگوەڕەکە) وەئاگاتی دەهێنایەوە... گوێت هەڵدەخست پاش چەند دەقیقەیەک، تاریکیی یادەکانت و داهاتووی فەرمان بەسەرادراو ڕۆشن دەبوونەوە... فەرمان بەسەردراو بەرەو ئاوەدانی و ئاسوودەیی هەمیشەیی دەچوو...

(تۆیش) سەری گلۆڵەی ڕێیە ئاڵۆزەکانی ژیانی داهاتووی

خۆتت دەدۆزیەوە... تا، بەرەبەیان گرێکوێرەکانی ڕێی ئاڵۆزت دەکردنەوە... ئەمە پرۆگرامی شەوانەتە، ئەوا (ئەمشەو) مەگەر کەسێکی هاوسێی ژوورەکەت – گەر بیەوێ – گوێ هەڵخات زرەی زنجیری دەست و پێی تۆ و ترپەی پۆستاڵی یاساوڵەکانی لا تێکەڵ دەبێ – ڕەنگە – تا بەرەبەیان هەوڵی ئەوە بدات دەنگە تێکەڵەکان لە یەکدی جیا بکاتەوە!

(تۆیش) لە سەرەتای نیشتەجێبوونت لەم ژوورەدا – هەوڵت دەدا دەنگە تێکەڵەکان لە یەکدی جیا کەیتەوە، کەچی دەنگی ناڵە و سۆزی (خۆیشت) تێکەڵی دەنگەکان دەبوو... تۆ کە شەوان بەهۆی (ئەو دوو دەنگە تێکەڵە) گرێکوێرەکانی ڕێی ئاڵۆزت شی دەکردەوە، کەچی ڕۆژی ئەو شەوە تا ئێوارێ ئەوەندەی دی گرێی دەسکردت لە ڕێیەکان دەدا و شەویش دەتکردەوە... کارێکی بێ ئەنجامی سیزیف ئاسات کەوتبووە ئەستۆ... تەنیا جیاوازیتان (ئەو سزا درابوو، تەکان باتە بەر بەردە قورسەکەوە، تۆیش: یەکەم بێ کار بوویت و تەنیا... دووەمیش بەخواشتەرخوازیی خۆتەوە هەڵت بژاردبوو و حەزیشت بەم کارە و دووبارەبوونەوەی ئەم کارەت دەکرد! سیزیف بەلەش ماندوو، تۆ بەمێشک، ئەو نەبەزی و نابەزێ، تۆ دەتزانی دەبەزی و دەشبێ ببەزیت. بەزینت بکەیتە نموونەی



نەبەزینی ڕاستەقینە، ئەو دڵتەنگ و تۆ دڵخۆش، ئەو لە پێناوی ئەوەی بیبەخشن، تۆ لە پێناوی بەخشندەیی خۆتا ئەمەت دەکرد!

هەموو شەوێ بۆنی مەرگ دەکەی! بەپەلەیت و حەز دەکەی تا زووە نۆبەش بگاتە سەر تۆ، تا بۆ دوا جار زرەی زنجیرەکانی دەست و پێی خۆت ئاوازی ماڵئاواییت بۆ ساز دات، گەلێ حەزت لە مۆسیقا دەکرد و لە ئاهەنگی دڵتەزیندا مەست دەبوویت و ڕۆحت بەرەو دنیای (یەکسان) هەڵدەفڕی، بەڵام ئەو ئاواز و ئاهەنگانە وەک زرەی زنجیر هەموو تەلەکانی سۆز و ڕۆحتی نەدەجوولانەوە و لەگەڵ ئاوازەکاندا نەدەتووایتەوە... هەرچیت هەیە لە یاد و سۆز و ماتەمینی و خۆشگوزەرانی، هەمووی لەسەر تامپۆی ئەم زرەیەدا سەمای ئومێدبەخشی (ژیانە مەرگێکی) بێ گرێ و جاویدی دەکەن! ڕاستە (ئێستا) حەزت بەمەرگە و مەرگ بووەتە ئاواتت و ناتەوێ خۆشت بکوژی...

ئەو شەوە، هەر سێ چوار دەقیقە و جارێک تەقەیەکت بەرەو دەنگی (سەگوەڕەکە) دەکرد...

بەرەو (سەگوەڕ) کەوتیتە ڕێ، پاش نیو سەعاتێ، پیرەمێردێک، سەرەڕێی لێ گرتی... گەشایتەوە... زانی ڕێت ون

کردووه، کەوتە پێشت، تەنیا دوو سێ ماڵت بینی، دیوارەکانیان نزم بوون، چەپەریان بۆ دەرگای حەوشەکانیان دروست کردبوو.. پاش یەک دوو قسەی سەرپێیی بۆت دەرکەوت، زۆری نەماوە ڕۆژ هەڵبێ... پرسیت:

(– ئیرە کوێیە؟)

وتی:

(– جنۆکەکانە!)

زۆر ترسایت، پیرەمێردەکە هەستی بەترسەکەت کرد و بۆتی ڕوون کردەوە: ئەمانیش تیرەیەکن لە خێڵی جاف و بەشێکن لە (ڕەش و بۆری)، هاتیتەوە سەر خۆ، پاش هەندێ حەسانەوە، هەتاو هەڵهات و کەوتیتە ڕێ...

لەو ڕۆژە بەدواوە، گەلێ شت لە بەرچاوتا گۆڕان، ماتی و بێدەنگی لکایە ڕەفتار و ڕوخسارتەوە، هەمیشە لە پەنایەک دەگەڕای، هاوڕێکانت چاویان پێوە نەبێ (دەگریای) بۆ نەسرین... باوکت... دایکە کلۆڵەکەت... پاش هەموو گریانێکت جۆرە دڵنەوایێ ڕووی تێ دەکردی، وەک ئەوەی فرمێسکەکانت هیس و گەردی دەروونتیان شۆردبێتەوە، پاک دەبوویتەوە، لەشت سووک دەبوو، بەرچاوت ڕوونتر... سوێندت دەخوارد



دەبێ هەمیشە سەری دایکت بەرز کەیتەوە و شانازیت پێوە بکات! بۆ هەموو ئیشێکی قورس خۆتت هەڵدەبژارد، وەپێش کەوتی، ڕووتی و بێ کەسی و برسیەتی هاندەرت بوو، بەگوڕتر سڵت لە هیچ شتێ نەدەکردەوە لە سەردەستەوە بوویتە سەرلق... زیاتر لە نێو هاوڕێکانتدا خۆشەویست بووی، پاش هەموویان نانت دەخوارد و پێش هەموویان هێرشت دەبرد، وەک کوڕێکی ئازای شۆڕشگێری ڕاستەقینە، ناوچەکە سوێندیان بەسەرت دەخوارد، هەرچەند ڕۆژ جارێ ئەم چیا و چیاتان دەکرد و بەشەڕی پارتیزانی گەلێ سەرکەوتنتان وەدەس هێنا، خەڵکێکی زۆر بوونە لایەنگرتان، ئەویش نەک تەنیا لەبەر پیرۆزیی ڕێیەکەتان، بەڵکو ڕەوشتی پاک و خاوێنیتان ببووە پارسەنگ و لە ئاستی ئامانجتان هاوسەنگ بوو! خەڵکە سادەکە بەراوردیان لە نێو ڕەفتار و ڕەوشتی ئێوە و دوژمنانتانا دەکرد... زۆربەیان بوونە هەواداری ئێوە... نەک تەنیا بەنان و ئاوی ئەوان، جلوبەرگ و تووتن و پەڕە سیغار و گەلێ شتی دییان بۆ مەیسەر دەکردن! تۆیش لەگەڵ شوان و گاواندا گەورە و بچووک... کوێخا و وەرزێر... تەنها بەزەردەخەنە و ڕێزگرتن، بناغەی ڕەوشتی شۆڕشگێرانەت دامەزراندبوو! خۆشەویست بووی... ڕۆژ بەڕۆژ کارەکەت لە لا پیرۆزتر دەبوو!

نەدەپەرژایتە سەر ئەوەی لە دایکە کلۆڵەکەت بپرسیتەوە... هیچت نەبوو تەنانەت پارەی پاکەتە جگەرەیەکت لە گیرفاندا نەبوو، بەچی هەواڵی بپرسی؟!

دوێنێ شەو... لە کاتی جوینەوەی ئەم یادانەتدا گەلێ تام و لەزەتی تاڵ و شیرینت وەردەگرت...

گاھ زەردەخەنە دەنیشتە سەر ڕوخسارتەوە، گاھ خامۆشی و ماتەمینی دای دەگرت... پڕ بەدڵ حەزت دەکرد بۆ چەند جارێ ئەم یادەت بۆ خۆت دووبارە و سێ بارە کەیتەوە، لەو ساتە خەونەیشدا دەس لە گەردنیان نێی! نەتزانی چۆن خەوت لێ کەوت و بەپێچەوانەی شەوانی لەمەوبەرت هیچ خەونێکت نەدی!

بیست شەوێ لەمەوبەر بوو فەرمانی ئیعدامی شێرزاد و ئازادت بیست... دوو برای جمک بوو، هەندێ خەمبار بوویت... هاوڕێیەتییان خۆش بوو، ماوەیێ لەمەوبەر لەگەڵ شێرزاد و ئازاد و دە دوازدە کەسی دیدا لە ژوورێکی زۆر چکۆڵە و تاریک و پیسا بوون... وەک کەلاک کەوتبوونە سەر یەکەوە، نیوەتان بەپێوە دەوەستان و بەشێکتان لە نێوان پێی وەستاواندا هەندێ دەخەوتن، بەنۆبە ئەمە کارتان بوو... کونە چکۆڵەکەی دەرگاکە، هەمیشە، بەنۆرە دەمی یەکێکتانی پێوە بوو... بەو شێوەیە هەواتان هەڵدەمژی... هەرکە بەیانییانی زوو یەکە یەکە



بەدارکاری و جنێو بۆ ئاودەستخانەیان دەبردن. هەریەکە و ماوەی دەقیقەیێکیان دەدانێ ئیتر لەبەر تێ هەڵدان زۆربەتان فریا نەدەکەوتن خۆ هەڵکات و ئێوارانیش بەهەمان دەستوور ئاودەستخانەتان بەم بەزمە دەستی پێ دەکرد! هەر تەنیا بۆ پێکەنین و هیچی تر، چەند ڕۆژ جارێ حەبی سکچوونیان تێکەڵ بەشۆربای نیوەڕۆتان دەکرد... ئیتر بەئارەزوو دەستتان لە ئاودەستخانە هەڵدەگرت و ئەو (سەتڵە) نایلۆنەی بۆ میزی شەوانتان لە نێو ژوورەکەدا تەرخان کربوو، دەبووە جێگیری ئاودەستخانە... شەوان، هەر یاساوڵێ نۆبەتی ئێشکگرتنەکەی تەواو بووایەت یاساوڵی دوای ئەو، بۆ ژماردنتان توند دەستی بەلووتییەوە دەگرت، لە پەنجەرەی دەرگا پۆلاینەکەوە دەیژماردن! ئێوەش تەنیا بۆ ئەزیەتدانی، جووڵە جووڵتان دەکرد و ژمارەکەتان لێ تێک دەدا... ژوورەکەتان هەمیشە تەڕ بوو و ئارەق لە هەموو لە شتانەوە دادەچۆڕا و لە زەوییە چیمەنتۆ ڕێژکراوەکەیا گۆلی دەبەست... هەمووتان خەوشی بۆن بوون!

جیاوازی لە نێو ئەو ژوورەی ئەوسات و ئەم ژوورەتدا گەلێ زۆرن، لەوێدا ماوەی بیرکردنەوە و بەخۆداهاتنەوەت نەبوو... ناڵەی جەرگبڕی هەندێ هاوڕێت سەری هەموو یادێکتی دەقرتاند... شەوانیش پاش سەعات دوازدە ناوی یەکێکتان

دەخوێنرایەوە، ئیتر بەرەبەیان گوێتان لە دەنگی ناڵە و هاوار دەبوو... کە دەرگایان دەکردەوە، وەک کەلاکێ تووڕیان هەڵدەدایە نێوتانەوە ئێوەیش بەوەی خۆتان بەبەرپرسیاری (ڕاگرتنی خوێنرێژییەکەی) دەزانی، دەکەوتنە گوڕ... خۆتانتان دەلاواندەوە... پێت خۆش و ناخۆش بوو، کە جیایان کردیتەوە، لە سەرێکەوە ماوەی ئەوەت هەبوو بتوانی دەست و پەنجەی خۆت بژمێری، لە سەرێکی دیشەوە گوێی ڕانەهاتووت بێبەری بوو لە بیستنی ناڵەی دڵتەزێن و دیدەیشت ئەو ڕەنگە سوورە دڵدارەتی نەدەبینی، کە هەموو شەوێ دەست و پەنجەتی ڕەنگ دەکرد! گەلێ جاریش پێکەنینت بەفەرەیدوونی هاوڕێت دەهاتەوە! کە لە هیچ شتێ نەدەترسا لەوەی کە ناوی بخوێننەوە! حەزی نەدەکرد بۆ بەربوونیشی ناوی بخوێننەوە. دەیویست – گەر بەریشی دەن، ئەوا یەکێ بەچپەوە پێی بڵێ! ناحەقی نەبوو... بەستەزمانە پێش ئەوەی بیهێننە ئەو ژوورەوە: واستەی گەورە گەورەیان بۆ کردبوو... لە مواجەهەدا پێیان دەوت غەمت نەبێ: بەزاواکەی فلانە کەس و بەپوورەکەی فیسارە کەسمان وتووە... هەندێ بەرتیلیشمان بەخەزووری فلانە گەورە داوە... چەن ڕۆژێکی دی بەر دەبی... کەچی پاش مواجەهە، هەرچییەکی هەبووایێ لە پارە و جگەرە و جلوبەرگ دابەشی دەکردە سەر هاوڕێکانی... هەرکە ناویان دەخوێندەوە



لەبەر خۆیەوە دەیوت: ئەمجارەیان... گرتی، کەچی بۆ کونێکی تاریکتریان دەبرد و تێلاتڕێنیان دەکرد، چاکتر تێیان دەسرەواند...

بۆیە ئێوەش جار جارێ لە نیوەشەودا یەکێکتان دەنگی خۆی دەگۆڕی و لاسایی دەنگی پۆلیسەکانی دەکردەوە بەدەنگی بەرز بانگی دەکرد... ڕادەپەڕی... ئێوە بێدەنگ دەبوون و خۆتان دەکردە خەو... ئەویش تا بەرەبەیان نەدەخەوت و چاوەڕێی (ژەمێکی) چاکی دەکرد! پازدەی مانگی ڕابردوو بوو، مواجەهەی شێرزادیان دا گەرچی ئەم ژوورەت لە جێ تایبەتییەکەی مواجەهەوە دوورە، بەڵام بەجۆرێ گوێت نابووە دەرگای ژوورەکەتەوە، لە زۆربەی قسەکانیان دەگەیشتی... شێرزاد دەیوت: (دایکە، خەفەت مەخۆ، تەنیا چاوت لە منداڵەکانم بێ...)

دایکی شێرزاد لەبەر گریان هیچی پێ نەدەوترا، تەنیا بەلاڵەپەتێیانە چەند قسەیێکی بێ سەروبەریت دەبیست... تەنیا بەدەنگی و بەمەزەنە تەمەنیت بەچل ساڵێک دەخەملاند... زیاتر گوێت هەڵخست جگە لە دەنگی ماچی، هیچت نەدەبیست، جار جارەش شێرزاد کوڕە چکۆڵەکەی ماچ دەکرد و دەنگی گریانی کوڕەکەی بەجوانی دەگەیشتە گوێیەکانت، هەرکە ماوەی

مواجەهەکە تەواو بوو، هەستت کرد زۆر بەهەڵەدا چوویت، کە کوڕ و دایک و منداڵیان لە یەکدی جیا کردەوە. دەنگی گریان و پاڕانەوەی دایکی بەجۆرێ بەرز بووەوە، هەموو بەندیخانەکە گوێیان لە دەنگی بوو، ئەمجارەیان تەمەنیت بە سی و دوو ساڵێ خەملاند.

سەری مانگیش واتە پێنج ڕۆژ لەمەوبەر، جارێکی دیش ناردیانەوە بەدوای دایکی شێرزاددا ئەمجارەیان بۆ دوا دیدەنیی ئازاد بوو... گوێت لە هەمان گریە و هەمان دەنگی ماچ بوو... ئازاد سەڵت بوو... جگە لە دایکی، گوێت لە دەنگی گریانی کەسێکی دی نەبوو! بەهەمان شێوەی جاری پێشوو گوێت نایە کونی دەرگاکەوە... هەرکە لە یەکیان جیا کردنەوە بەدەنگی لاڵەپەتێیانە چەند قسەیێ بێ سەروبەریت دەبیست... تەنها بەدەنگی و گریانەکەی دایکی شێرزاد، بەجۆرە نوزەیەکی تاساوەوە بەرەو گوێیەکانت دەهاتن... جارێکی دی تەمەنیت خەملاند... هەزار سوێندت دەخوارد کە ئەم دەنگە دەنگی پیرەمێژنێکی تەمەن سەد ساڵەیە! بێ کەڵکیی ژیان و پووچی، دەسەوەسانی لەگەڵ دەنگی گریانەکەی دایکی شێرزادا، هەراسانیان کردی، لەگەڵ فرمێسکە درشتەکانی (ئەو) و (تۆ)دا سەرەتا و کۆتاییی نائومێدی بەرەو زەویی بەندیخانەکە



دادەتکان... پێت سەیر نەبوو و بەلاتەوە زۆر ئاسایی بوو، مرۆڤی سەدەی بیستەم لە شەو و ڕۆژێکدا وای لێ بێ و نەتزانی چۆن وشەیەکی ترۆتسکی (لەو کاتەدا) مێشکتی کردە مەیدانی ڕمبازی و لە چاو و دەم و گوێتەوە پیت پیت هاتنە دەرێ و لە ژوورەکەتا پەنگیان خواردەوە، گەمارۆیان دای، تەنگیان پێ هەڵچنیت، بەمست و پێلەقە و سەر، بەر بوویتە دیوارەکانی ژوورەکەتەوە، ماندوو بوویت وردە وردە پیتەکان لە نێو ئارەقی لەشتا توانەوە... ئەوجا لەسەرخۆ وشەکەت دووبارە کردەوە:

(لە سەدەی بیستەمدا، هەرکەسێ ئاسوودەیی بووێت، ئەوا بەهەڵە لەو سەدەیەدا لە دایک بووە!)

بۆ ئەوەی لە بیر نەچێتەوە، هەوڵت دا بەزنجیرەکانی دەستت لە قەد سنگی یەکێ لە دیوارەکانی ژوورەکەتا بینووسی... گوڕت دایە بەر خۆت، یەکێ لە ئەڵقەکانی زنجیرەکەی دەستت هەڵبژارد بەدوو پەنجە گرتتە دەستتەوە... تەنیا لە وشەی (سەگوەڕ) بەولاوە هیچی دیت بۆ نەنووسرا! هێدی بوویتەوە، لە دیوارەکە دوور کەوتیتەوە، هەردوو چاوت بڕییە وشەکە... نا... نەخێر... چاوت ڕێشکە و پێشکەی نەدەکرد... تەختە دیوارە ڕەشەکەت هەڵکۆڵیبوو، بۆیە وشەی (سەگوەڕ) سپی دەچووەوە! ڕەنگە ڕەشەکەی دیوارەکە بەپیتەکانی وشەکە خۆی ئارایشت

کردبوو، ئەوەندە بەبێدەنگییەوە تێی ڕامای و لێی ورد بوویتەوە تا وشەکە نیگای سەگێکی زلی وەرگرت، چەند جارێ لەسەریەک بەوەڕینێکی نائاسایی کاسی کردی... بەتوندی تەکانت دایە بەر خۆت، پشتت نایە قەد وشەکە و (تۆیش) بەدەنگێکی بەرزتر دەستت بەوەڕین کرد! زۆر وەڕیت، دەنگت بەرز کردەوە، هیچ یاساوڵێ – کە لەو بەردەمەدا هاتوچوویان دەکرد – نەهاتنە نزیکتەوە، هەستت کرد گوێیان لە دەنگت نییە، زیاتر، زیاتر، دەنگت بەرز کردەوە! خۆتت خستە سەر چوارپەل بەنێو ژوورەکەتا قەڵەمبازت دەهاویشت، ئەمسەر و ئەوسەرت دەکرد و دەوەڕیت... جگە لە خۆت کەسێ گوێی لەم وەڕینەت نەبوو!

جا بۆ پێت سەیرە؟ لەم سەدەیەدا، لە هەندێ شوێنی ئەم زەمینە برینداردا، نەک ناپاڵم، بەڵکو بەهێزترین چەک دەتەقێننەوە نەک تەنیا زۆربەی زۆری مرۆڤەکانی ئەم سەدەیە گوێیان لە ناڵە و گریەی کوژراوان و بریندارانی نییە کە لە بەرچاو و گوێیان دان، بەڵکو دەنگی تەقینەوەی ئەو چەکانەش نابیستن... بۆ پێت سەیرە. دوێنێ هەرکە فەرمانی ئیعدامکردنتیان خوێندەوە، دوا داوات بینینی دایکت بوو، ئەوا ئێستا بەمەزەنەی خۆت، سەعات لە دەوری دوازدەی نیوەڕۆدایە



و دوازدە سەعاتی دیت ماوە –سەعات دوازدەی شەو– فەرمانەکەت جێبەجێ دەکەن! (ئێستا) لەبەر خۆتەوە بەراوردی دڵی خۆت دەکەی!

(گەر دوێنێ، ئاگاداریان کردبێ، ئەوا بەم بەیانییە، زوو، زۆر زوو، لە گەراجدا چاوەڕێی دەکرد! ڕێیەکە زۆر دوور نییە، لە کەرکووکەوە بۆ هەولێر هەر سەعات و نیوێک دەبێ.... لە هەولێریشەوە بۆ ئێرە، نەوەت و یەک کیلۆمەتر... بڵێین، ئەمەشیان سەعات و نیوێکی دی... کەشمەکەش و جنێو و ئەمسەر و ئەوسەری پێ دەکەن ئەوا هەرچۆنێ بێ و لە هەموو حیسابێکدا دەبێ دەوری سەعات دوازدە بگاتە ئێرە! نازانم بۆ وا دوا کەوت! بشێ هەواڵیان پێ نەدابێ، نا... باوەڕ ناکەم... نا... لە وەتەی لێرەدام، هەمیشە هەواڵیان بۆ کەسوکاری – ئەوانەی ئیعدام دەکرێن – ناردووە... بشێ موقەدەرێ نەهاتبێتە ڕێ؟!)

دەترسی فەرمانەکەت (چەند سەعاتێ) پێش خەن، گەلێ جار شتی وایان کردووە... کامەرانی بەستەزمان نەک تەنیا کاتی جێبەجێکردنی ئیعدامەکەیان چوار سەعات پێش خست بەڵکو چوار ساڵ تەمەنیان لە ناسنامەدا پێ بەخشی، کلۆڵە چواردە ساڵان بوو، کردیانە هەژدە ساڵان دەبووایێ سەعات دوازدە ئیعدام بکرێ کردیانە سەعات هەشت. بەدبەختە خۆیشی

نەیدەزانی لەسەرچی ئیعدام دەکرێ... لە ژێر داردا هەرچییەکیان پێ دەوت، ئەویش دەیوت: لێم مەدەن، ئەوەی ئێوە دەیڵێن ڕاستە، پاشانیش لە نێو هاوڕێکانیا، لە بەندیخانەدا وتبووی:

(خۆیشم کەوتبوومە گومانەوە... وام دەزانی ئەوانەی ئەوان دەیڵێن ڕاستە و من کردوومە، بەڵام یەک حیساب بوو... خۆ قالەش وەکو من بوو، هاوتەمەن، هاوپۆل بووین نەیدەویست (بوختان) بەخۆیا کات و هەر دەیوت: (نا... وا نەبوو... ئاگام لێ نییە) تا لە ژێر داردا تاسانیان!

(تۆ) لە خۆت ناترسی... لە دڵی دایکت دەترسی! ناحەقت نییە دڵی دایک شتێکی سەیرە! بەچاوانی خۆت بینیوتە، خۆ چاک وەبیرت دێتەوە شەش حەوت ساڵێ لەمەوبەر بوو:

چووبوویتە سەر بەردێکەوە، قسەت بۆ هاوڕێکانت دەکرد... زستانە ڕۆژێکی تووش بوو، هەموو زەوی سپی دەچووەوە، (تۆیش) بەدەنگی بەرز دەتوت: (کوڕینە... ڕاستە هەمووتان کوڕی دایک و باوکی خۆتانن و زۆربەتان بەناز و نیعمەتەوە پەروەردە کراون! بەشەرافەتمەندییەوە ژیانتان گوزەراندووە و خزمەت کراون، ڕاستە خۆشەویستی دایک و باوک و کەسوکارتانن... بەڵام دەبێ بۆتانی ئاشکرا بکەم کە ئێمە لێرەدا



لە نێو ئەم چیایانەدا، هەندێ فام و بیری دیمان لا دروست بووە! بەپێچەوانەی ئەو پەروەردە و ڕێنماییانەیە کە لە ماڵی خۆتانا فێری بوون! پێتان سەیر نەبێ لە پێناوی (مان)دا دەبێ وەک پیاوکوژی ڕەسەن ڕەفتار بکەین و چاکتر فێری ڕێگری و کوشتار ببین! دەبێ ئێستا لەم ڕۆژەدا بیانکوژین و چەکەکانیان وەدەس بێنین... بیانکوژین و نانەکانیان وەدەس بێنین... ڕاستە زۆربەیان تەنها ژمارەن و دوژمنی ئێمە نین و... مقاشی دوژمنمانن... بەکورتی دەمەوێ هەرچی بەزەیی و سۆزتان هەیە، لە مێشکی خۆتانا بیانمەیێنن... جێمان نییە دەسگیری تیا بەند کەین، یا وەک بارمتەیێک ڕای گرین... ڕەوشتی (ئەمڕۆی) ئێمە، بەنابەجێی دەزانێ گەر دەسگیر بەرەڵڵا بکەین، چونکە جارێکی دی بۆمانی دەنێرنەوە، دوور نییە ئەوجا (ئەو) دەسگیرمان بکات... جگە لەمانەش نانمان نییە بەخێویان کەین... ئێمە پێویستیمان بەچەک و نانی ئەوان هەیە! ئەم قسانەم مانای دڕندایەتی و پیاوکوژی نییە... ئێمە لەسەر زەویی باو و باپیرانی خۆماندایین و ئەوان بۆمان دێن... ئێستا دەمەوێ، دە کەسێ خۆی هەڵبژێرێ، تا کاری ئەمشەومان ئەنجام بێنین...)

ئێوە چل پەنجا کەسێ بوون، هەموو هەر دەستی بەرز کردەوە و دەیوت: (من)، ناچار بوویت هەڵبژێری... هەرکە دە

کەسەکەت هەڵبژارد و بۆ ئەوەی ئەوانی دی دڵیان لە خۆ دانەمێنێ، دابەشیانت کردە سەر سێ قۆڵ و بۆ ئەوەی ڕێی کشانەوەتان خۆش کەن، هەر قۆڵە و لە دووریی پێنج شەش کیلۆمەترێکدا دایانت مەزراند... خەریکی باسکردنی (نەخشەکە) بوویت دڵشادت لێ ڕاپەڕی بەتووڕەیییەوە دەنگی بەرز کردە سەرت:

(بۆ من نابەی! تا کەی بەمنداڵم دەزانی؟)

(نا... بەمنداڵت نازانم... ئەم جۆرە کارانە پێوەندییان بەگەورە و بچووکییەوە نییە... پەلە مەکە بۆ کاری قورستر هەڵم بژاردوویت!)

(هەمیشە هەر وا دەڵێی... چاوەڕێکردن، هێزی لێ بڕیوم، پێت خۆش بێ و پێت ناخۆش بێت، دەبێ ئەمجارەیان منیش ببەی!... عەیب نییە ئەمە شەش حەوت مانگە ئەم تفەنگە نایابەم پێیە، هەر بۆ کەو و سوێسکە بەکارم هێناوە! ئەگەر هەر سووری لەسەر ئەوەی لە بەشداربوونی ئەمشەوتان بێ بەریم کەیت... فەرموو ئەمە تفەنگەکەم و...)

بەجۆرێ تفەنگەکەی نزیک کردەوە، ئەگەر خۆت وەلا نەخستبا بەڕوخسارت دەکەوت... بێدەنگ بوویت... حەزت دەکرد وشەیەک بدۆزیتەوە هەندێ لە ئاستی خوێنگەرمییەکەی دڵشاد سارد



کەیتەوە، کەچی هیچ وشەیەک لە ئاستی باوەڕی ئەودا نەبوو... چەند وشەیەک بەزمانتەوە مەیین... ناچار بوویت بەبێدەنگییەوە قایل بیت... لە ڕاستیدا دڵشادت بەمنداڵ دەزانی... تەمەنی شانزە ساڵان کەمتر بوو! تاقانەی دایک و باوک و زۆر خۆشەویستیان بوو... لە سەرەتادا کە خۆی گەیاندە ئێوە، کاری (تەتەریت) پێ سپارد، گەلێ چاپووک و زیرەک بوو!

ڕێیەکەی ئەو شەوەتان دوور و دژوار بوو! کارەکەشتان قورس و ناهەموار، دەبووایێ دوو سەعاتە ڕێ زیاتر بەنێو سەرباز و جاشا بڕۆن، تا خۆتان دەگەیێننە بۆڕییە گەورەکانی نەوت... کەوتنە ڕێ دڵشاد وەپێشتان کەوت... گەرچی بارتان قورس بوو، توانیتان، بەدزە دزە، پاش سەعات دوازدەی شەو بگەنە شوێنێ مەبەست! بەدەنەمێت بۆڕییەکانتان تەقاند، ئاگر بەرز بووەوە، ئەو شەوە تاریکە بووە ڕۆژی ڕۆشن... لەملا و ئەولای (ڕەبیەکانەوە) کەوتنە بەر دەسڕێژ، یەکەم جار دڵشاد بەرکەوت نەهاتە زمان! بەهەر جۆر بوو توانیتان لەگەڵ تەقەکردندا، تەرمەکەی هەڵگرن... گەڕانەوە، پاش سەعات دەی بەیانی گەیشتنەوە بنکەکەتان! هەموو هەر مات و بێدەنگی کەوتنە گوڕ، خەریک بوون گۆڕ بۆ دڵشاد هەڵکەنن، لە دوورەوە هەندێ تارماییت بینی، هێستر سوارێ لەگەڵ دوو کەسی دیدا

بەرەو لای ئێوە دەهاتن... نزیک بوونەوە، هێسترسوارەکە ئافرەتێکی شارستانی بوو، دوو کەسەکەی دیش هاوڕێی خۆتان بوون. هەرکە ئافرەتەکە، ئێوەی بەم شێوەیە بینی وەک ئەوەی دڵی خەبەری دابێ، بەنەڕە قیژاندییە سەرتان:

(کوا دڵشاد؟)

واقتان وڕما، زمانتان تێک ئالا، ڕەنگتان تێک چوو، بێ ئەوەی کەسێکتان چ بەزمان یا بەئیشارەت شتێ بڵێ، یەکسەر دایکی دڵشاد ڕووی کردە تەرمەکە – کە بەبەتانییە کۆنێ پۆشیبووتان – پێش ئەوەی سەری هەڵبداتەوە دەستی بەگریان کرد، ئێوەش دۆش دامان... بەجۆرێکی دڵتەزێن دەیلاوانەوە:

– ڕۆڵە... دەمزانی ناتبینمەوە... کەسەکەم پشتت شکاندم.

هەرکە لای کردەوە، ئێوەی بینی دڵگیرترن بەتەوسەوە پێی وتن:

– ئافەرین بۆ ئێوە، بۆ پیاوەتیتان... ئەرێ بەزەییتان پیا نەهات... دڵتان پێی نەسووتا؟ ها؟ ویژدانتان نەبوو؟

پیاوێکتان تیا نەبوو پێی بڵێ: کوڕم هێشتا تۆ منداڵی... ئەی هاوار قوڕی کوێ بەسەری خۆما بکەم! بەخوا دڵە گیان دەمزانی ناتبینمەوە.



بەتانی سەر تەرمەکەی وەلادا، چەند جارێ بەزمان جێ گوللەکەی سەر تەوێڵی دڵشادی دەلێستەوە، بەسۆزێکی خواوەندانەوە، دەیلاواندەوە، ئێوە کەسێکتان توانای ئەوەی نەبوو بێتە زمان و قسەیەکی بۆ بکات، پێت سەیر بوو ئەو هاوڕێیانەت کە هەمیشە گاڵتەیان بەفرمێسک دەکرد، لەگەڵ دایکی دڵشاددا هۆن هۆن فرمێسک لە چاوانیان دەهاتە خوارێ... دایک، بەجۆرێ کوڕی دەلاواندەوە، دڵی بەردینی دەتاوانەوە، دەستی دەخستە ژێر سەری دڵشاد، گاه ماچی دەکرد و گاه دەیلێستەوە، لەپڕ سەری دایک وەک سێوێکی نەوڕەس لەبەر تەرزەی ناوەختا هەڵوەرێ، ئاوها سەری بەسەر دڵشادا کەوت و خامۆش بووەوە! کڵۆڵە بۆ دوا جار چاوانی لەیەک نا... حەپەسان ڕێی هەموو شتێکی لێ گرتبوون، دۆش دامان، نەتاندەزانی چی بکەن! چ کارەساتێ بوو ڕووی تێ کردبوون. هەموو بت ئاسا ڕەپ وەستابوون. نە جووڵە، نە دەنگ... هیچ هەر هیچ.

شتێکتان بۆ نەکرا... لەپڕ دوو فڕۆکەی (مێگ) دڕی پێ دان، شەستیر، بێدەنگییەکەی شەقار کرد! پەنا بەرد و کونە تەیارە و کەند بووە قەڵخانتان... یەک دوو جار ئەمسەر و ئەوسەریان کرد و ئەوجا بەساروخ تێتان بەر بوون، لە نزیکی هەریەک لە ئێوە

ئاگر و دووکەڵ بەرز بووەوە... چل دەقیقە... بەدەم ئاسانە وەک ئەوەی لە نێو دۆزەخدا بن، کات نەدەگوزەرا، فرۆکەکان ڕۆیشتن، ئێوەیان سپاردە هەوڵ و کۆششی یەئس ئامێز و خوێنی گەشی دوو هاوڕێی بەجەرگت کە باسک و ڕانیان تەڵەزمی ساروخی بەرکەوتبوو... بێ دەربەست بوون ئێوە لە جێیەکانی خۆتانەوە هەڵسان... نەتانزانی چ هێزێ بەرەو لای تەرمی دڵشاد و دایکی ڕاتانی دەکێشا... نزیک بوونەوە هەموو لە یەک کاتدا بت ئاسا وەستان! حەپەساو، گێژ و کاس سەیری دیمەنەکەتان دەکرد... ئاگر لە هەردوو تەرمەکە بەربووبوو، هەردوو بووبوونە (قەرەبرووت) دوو کاسەی ڕەش هەڵگەڕاوە هەندێ ئێسقانی دەست و پێ، کە هەرگیز لەیەک جیا نەدەکرانەوە کە کامیان هی دڵشادە و کامیان هی دایکیەتی... هەندێ خۆڵەمێشی دیش بەسەر ئێسقانەکانەوە بوو... هەر ئەوەندەی بڵێی یەک و دوو، بێ ئەوەی کەسێ شتێ بڵێ، هاوڕێکانت کەوتنە گوڕ و هەر لەو شوێنەدا چاڵێکیان هەڵکەند هەردوو تەرمی بەخۆڵەمێشبووی کوڕ و دایکیان لە چاڵ نا... هەندێ خۆڵیشیان کەڵەک کردە سەر چاڵەکە و شێوەی نیمچە قەبرێکی وەرگرت... هەر ئەو ڕۆژە بۆ ئێوارە (بلەی خۆشنووس) لەسەر تەختە بەردێکی پان و زلدا بەخەتی ورد هەندێ نووسینی هەڵکۆڵی و لە ژوور گۆڕەکە و لە شێوەی کێڵ دای



چەقاند، چاک وەبیرت دێتەوە ... نووسینەکە گەلێ کاریگەر بوو، لەبەرت کرد: ئێستاش زۆربەی دێرەکانیت وەبیر دێتەوە کە بەم سەرەتایە دەستی پێ دەکرد:

(ئا لێرەدا... خۆڵەمێشی جەستەی کوڕ و دایک تێکەڵ بوون، ئارامگای بەختەوەرترین دوو مرۆڤی سەدەی بیستەمە... دڵشاد گەردنی لە ژێر باسکی دایکیدایە... ڕۆحی هەردووکیانیش لە ئامێزی دایکی بریندارردا چاوەڕێن... چاوەڕێی ئێمە و تۆی ڕێبواری ماندوو کە ڕێکەوت چاوت بەم دێرانە دەکەوێ بەڵێ دڵشاد و دایکی، لە باوەشی دایکی بریندارردا چاوەڕێن... هیممەتێ...)

پاش ئەو ڕووداوە، هەر یەک دوو مانگ جارێ باوکی دڵشادت دەبینی، گەلێ شەو تا بەرەبەیان، لە پاینی گۆڕەکەدا دادەنیشت، تاقە فرمێسکێ لە چاوانی نەدەهاتە خوارێ... ئەوەندە بێدەنگ بوو وەک ئەوەی زمانی لە بیر چووبێتەوە، ئاوها دەهاتە بەرچاو جگە لە (ئا) و (نە) بەولاوە هیچی دی نەدەوت...

(ئێستایش) بەجۆرێکی سەیر، وشەکانی سەر کێڵی قەبرەکەی دڵشاد و دایکی، مێشکتی ئاخنیوە... لە لایەکەوە چاوەڕێکردنی دایکت گێژی کردووی لە لایەکی دیشەوە (کێڵە قەبرەکە) بووەتە چرا و بەر دیدەتی ڕۆشن کردووەتەوە... ئەوا

هەڵسایتە سەرپێ؟ سەیری ئەڵقەی زنجیرەکانی دەست و پێت دەکەی؟ ئەوا دانەیەکیانت هەڵبژارد! ناتەوێ هیچ وشەیەکی قەد دیوارەکان کوێر کەیتەوە... دەتەوێ بۆ یادگاریی خۆت و دڵشاد و دایکی، وشەکانی سەر کێڵەکەیان بنووسی... ئەوە چیتە؟ یەکەم پیت (س)ین نییە؟ ئەوە خۆ جارێکی دی وشەی (سەگوەڕت) نووسی؟!... ئەوە چیتە دەتەوێ بوەڕیت؟

باوەڕ ناکەم تاقەتی وەڕینت هەبێ. چ کەسێ گوێی لە دەنگت نابێ، دوور نییە گوێیەکانیشت یاخی بن و نایەنەوێ وەڕینت بژنەون! چاکترە... گەلێ چاکترە بەرەو دنیای ئێستات بگەڕێیتەوە... یانی چی وا دایکت دوا کەوت؟! بڵێی هەواڵەکەیان پێ نەدابێ، یا هەواڵیان پێ دابێ و کلۆڵە زراوی تەقی بێ! نا، باوەڕ مەکە، دایکت بەجەرگە و دنیادیدەیە، چەند جارێکیش خۆت لە دەمییەوە دەتبیست (بەرخی نێر بۆ سەربڕینە)، باوەڕ مەکە دایکت ئەوەندە بێ هێز بێت! جگە لەمانەش گەلێ باوەڕی بەخوا و چارەنووس هەیە! دوور نییە – کە هەواڵەکەیان پێ دابێ – وتبێتی: ئەمەی لە نێوچاواندا نووسراوە، دەبێ هەر وابێ!

نا... قەد باوەڕ مەکە ئەم هەواڵە کار لە دایکت بکات و دەست و پێی بشکێنێ... دایکت گەلێ بەجەرگە، لە ڕووی برسییەتیا



مەردانە مەچەکی هەڵمالیوە، ئەوەندەی هەموو کرێکارێکی بەتوانا، لەباتی شەش حەوت سەعات هەر لە بەیانییەوە تا دنیا تاریک دادێ جلشۆری و نانەوایی ماڵان دەکات! لەمانەش بەولاوە، پاش مردنی باوکت و نەسرین، گەلێ جار خۆی ڕوو بەڕووی هەندێ کاری ترسئامێز دەکرد مانای ژیان – بەلای دایکتەوە – خۆ ئامادەکردنە بۆ هەڵبژاردنی جۆری مردن، دایکت هەرگیز لە مردن نەترساوە و ناترسێ.

ئای کە دڵت بەدایکت خۆش بوو! هەرکە دەتبیست، بێ ترس سەر بەهەموو کونێکدا دەکات (بەیاننامە نهێنییەکانتان بڵاو دەکاتەوە، شارە و شار، بێ دەربەستانە لە نێو بەندیخانەکانەوە نامەتان بۆ دەردەکاتە دەرێ و دەیداتە دەستی (تەتەری) نێو شارتان).

لە سەرەتادا وات دەزانی تەنیا لەبەر خاتری تۆیە وا دەکات... تا جارێکیان کە پێشمەرگە بووی و ئیجازەت هەبوو بەدزییەوە چوویتە نێو شار، کەچی دایکت زۆر ئاسایی، سووکە بەخێرهاتنێکی کردی، بێ ئەوەی بگرییێت و بتلێسێتەوە، لەگەڵتا دانیشت، پێشەکی هەواڵی هاوڕێکانتی پرسی... گەلێ گلەیی لە سستی و کەم فامی و بێ دەربەستیتان هەبوو... نەفرەتی لە ڕەوشتی (ئەو دواییەتان) دەکرد بەیەک دوو وشەی ئامێتەبووی

بێزوو نەفرەت وتی: (شەرمە... داوەشێن... گەر دەربەستی ڕۆحی خۆتان نایەن و سەرەڕۆیانە مل دەنێن و یەکدی دەکوژن... دەربەستی ئێمەی دایک بێن، ئێمەی دایک نایزانین ئێوە لەسەر چی ناکۆکن و لە براکوژیدا دەستتان بەخوێنی یەکدی سوور بووە!)

ئێمە هەموو شانازی بەکوڕ و برا و کەسوکاری خۆمانەوە دەکەین کە لە دەرێدان و بەرگری لە مافمان دەکەن! کەچی ئێوە... هەی... نازانم چیتان پێ بڵێم هەی بەرخوردار بن! براکوژیتان لەچی... سەیرە لەوەش نەگەن کە دوژمن وای لێ کردوون و دووبەرەکیی خستووەتە نێوانتانەوە. ئێوە جارێ شتێ بۆ ئەم میللەتە سووتاوە وەدەس بێنن، پاشان لەسەر ڕەنگی (زەرد و سوور و سپی و ڕەش) ئەوەندە بفڵتێنن و دەنگ بەرزەوە کەن تا قۆڕ دەبن).

سەرت داخست زانیت دایکت ڕاست دەکات و شەرمە بۆ هەموو لایەکتان وا لە هیچەوە و بەقسەی بەدفەڕ و دوژمن، وا دەستتان بەخوێنی یەکدی سوور کردووە!

دوێنێ شەو بەئاستەم و پچڕ پچڕی یادی ئەم سەرگوزشتانەت وەبیر دەهاتەوە، ئەوا (ئێستا) بەجۆرێکی دی، بەقەد و قەوارە و بونێکی دییەوە، سەرنجی ئەو سەردەمە تەڵخ و



قێزەونە دەدەی! (ئێستا) بەهەردوو دەستت مێشکی خۆت دەگوشی و ناتەوێ ناوی ئەو هاوڕێیانەت وەبیر بێتەوە کە بەدەستی یەکدی کوژراون و سەرنگون بوون! بەڵام ئەم یادانە لە دەست و مێشکت بەهێزترن و زۆرانبازیت لەگەڵدا دەکەن و داوای حیسابت لێ دەکەن!

هەرکە ماوەی مەرەخەسییەکەت تەواو بوو، بەرەبەیان، خواحافیزیت لە دایکت کرد، بەپەلە بەکۆڵانە باریکەکاندا تێ پەڕیت، (سەگوەڕی) سەگی (بەرەڵڵا) خەریکبوو ئاشکرات کات! گەڕایتەوە، یەکسەر لەگەڵ هاوڕێکانتا کۆ بوویتەوە:

(براینە... من بەش بەحاڵی خۆم ڕێ لە کەس ناگرم! هەریەکە و کەیفی خۆیەتی و سەرپشکە لە دەستنیشانکردنی سەنگەری خۆی لەم دووبەرەکییە پیسەدا جێی خۆی دیاری بکات! بەڵام وەک دەزانن سەنگەری ڕاستەقینەی ئامانجی ئێمە (یەکیەتییە) من خۆم بەهیچ بەرەیێک نابەستمەوە، هەردوو بەرەکە ناڕاست و ڕاستن – بۆیە من بڕیارم داوە، پاش ئەوەی بۆم ڕوونە، دانیشتن تاقە خزمەتە، ئەم تفەنگەم دادەنێم و هەرگیز لە ڕووی برای خۆمدا نایخەمە کار... ئێوەش هەڵبژێرن و کەیفی خۆتانە! (ئێستا پێکەنینت بەو جۆرە بیروڕایەی ئەوسات دێت... ئەوا (ئێستا) لەسەر یەک بۆ خۆتی دووبارە دەکەیتەوە، دانیشتنی

چی؟ کەی ئەم میللەتە بێ تفەنگ لە ڕاستی دەگەن... ڕاستی بێ تفەنگ وەک وشەی بێ پیت وایە... گەلێ پێکەنینت بەخۆت دێتەوە... کە پاش ئەم هەموو تاقیکردنەوەیە تازە ئەم حەقیقەتەت بۆ دەرکەوتووە... ئەوسا تاقە شتێ ڕێی لە هاوڕێکانت گرتبوو، ئەوە بوو (کە تفەنگ دانێن چی بکەن!)

هەریەکە و بەجۆرێ لە لای میریدا تاوانبار بوون، هەرچی ئەمسەر و ئەوسەرتان کرد نەگەیشتنە ئەنجام! پێتان خۆش بوو بەکۆمەڵ خۆتان بکوژن نەک لە شەڕی براکوژیدا بەشداری بکەن! یا خۆ تەسلیم کەن!! سەری هەمووتان دێشا، وڕ و کاس بوون، هەزار تف و نەفرەتتان بۆ سەبەبکار دەنارد! تۆ چەکەکەت دانا... بەدزییەوە خۆت گەیاندە (بەسرە) پێناسی ساختە و ناوگۆڕین فریات کەوت! خۆتت شاردەوە بەنانە سکی ئیشت دەکرد... ئەوەندە ئاگات لە دایکت نەما، وات زانی دایکت دڵی بەم کارەت خۆش دەبێ، کەچی پاش چەن ساڵێ غەریبیت و لەگەڵ یازدەی ئازاری حەفتادا گەڕایتەوە، دایکت پێی وتی:

(حەیف... پیاو نابێ سەنگەر جێ بێڵێ و چەک دانێ... تفەنگ بۆ کورد پیاوەتییە! هەر کاتێ چەکی پێ نەبوو لە هەر کوێدا بێ ئەوا پیاوەتیی لەگەڵدا نییە...)

بۆت دەرکەوت ڕاست دەکات، ئەو چەند ساڵەی غەریبیت زۆر



شتی بۆ سەلماندی، هەرکە دەیانزانی کوردی یەکەم بەگێل و گەوجیان دەزانیت و گاڵتەیان پێ دەکردی، تانە و توانجیان تێ دەگرتی، هەر تەنیا لەبەرئەوەی کە کوردی و هیچی تر... بێچەکیش هەموو دەمارێکی پیاوەتیتی سست کردبوو... لە ساڵانی ١٩٧٠ تا ١٩٧٤ لە کونجێکدا لەگەڵ دایکە کڵۆڵەکەتدا دەژیایت... ڕقت لە چەپڵە و دروشمی نێو ئاودەستخانەکان دەبووەوە –کە ئەو چوار ساڵە– لەسەر دیواری ئاودەستخانەوە چووبووە سەر زاری زۆربەی زۆری خەڵکەکە... هەوڵت دەدا بۆ خۆت و دنیای خۆت و بەختەوەریی دایکە کڵۆڵەکەت بژیت... هەرکە ساڵی ١٩٧٤ لەگەڵ ئەحمەد و ڕەئووفی هاوڕێتا لە کەرکووکەوە بەرەو سەنگاو کەوتنە ڕێ و ئیتر نەگەڕێنەوە: کەچی لە سەنگاوەوە هەتا چەمچەماڵ گەڕایتەوە ئەحمەد و ڕەئووف گەلێ زۆریان لێ کردی:

(عەیبە و تازە هاتووین و دوایی خەڵکەکە چیمان پێ دەڵێن...)

تۆیش بەئەوپەڕی خوێنساردییەوە دەتوت:

(برا... من لە ترسی ئەو دە دوازدە کەسە کەرکووکم جێ هێشتووە کەچی ئەوان، پێش ئێمە لەوێدان و هەریەکەش لە سێ ڕەخت کەمتری نەبەستووە!)

هیچ، زۆریان لێ کردی... لە ڕوودا مایت، بەنابەدڵییەوە،

بەشداریت کرد و بوویتە شاهێدی ئاشبەتاڵ، گەڕایتەوە... هەموو ئەو (جوامێر و عەگید و ڕۆستەمانەت) بینی کە چۆن بەشەو و ڕۆژێ پێستی شێریان لەبەر داماڵین و کورتانیان لێ نان... ئای کە پێکەنینت بەخۆت و بەقوڕبەسەریی میللەتەکەت دەهاتەوە کە دەتبینی، زۆربەی زۆری (سکرابە سیاسییەکان) هەریەکە و حیزبێکی دامەزراند... هەموویش هەر دەیوت «حوکمی زاتی حەقیقی! و لەسەر ڕێبازی مارکسی».

یەک دوو مانگێ پاش ئاشبەتاڵ، زانیت، چەند کەسێکی (مودمن) لەسەر پێشمەرگایەتی بەچیاوەن...! ئیتر کوردی تفەنگ دۆست لێیانەوە ئالان... بوونە سەد، دوو سەد، هەزار... هەر کوردی دەچووە سەریان... پیشەی پشوو، کوردفرۆشی و کوردایەتی لە برەودابوون و هاوسەنگ!

ئەوە بۆ ئەوەندە سەرەتاتکێ دەکەی و هەڵدەستیتە سەرپێ و لە کونی دەرگاکەوە سەیر دەکەی؟! جگە لە تارماییی یاساوڵەکان چی بەدی دەکەیت؟ ها؟... دەنگی گریان دەبیستی؟ دەنگی گریانەکە وەک جۆرە ترسێکی نادیار هەموو لەشت بەسەر دەکات! ئای لە دەنگی ئەو گریانە بێ ئامانە چۆن ئەم بێدەنگییەی ژوورەکەت شەقار دەکات... ها... تازە وەبیرت هاتەوە... خۆ دەبێ ئەمشەو سێ کەسی دی لەگەڵ تۆدا فەرمانی



ئیعدامەکەیان جێبەجێ بکرێ! ئەوە دەنگی گریانی کەسوکاری ئەوانەیە! ئەوە دەنگی ژنەکەی شێرکۆی هاوڕێتە... ئا، خۆیەتی... ئەوە دەنگی شێرکۆیش بەنووزەوە دەگاتە گوێت... ئەوە بۆ سڕ بوویت؟ ئەوە چ یادێکە وا لە ناوەختا سەرەڕێی لێ گرتی؟ ئا... هەست بەچ ئازارێ دەکەی، خۆ ئەوە خۆتت بەپێوە بۆ ناگیرێ! چاکتر وایە لە پەنایەکی ژوورەکەتا دانیشی، نەخێر وا دیارە ئەم (یادەت) دەسبەردارت نابێ وا لێت هاتووەتە پێش و گەمارۆی داویت، ئێستا نە ئێستا هێرش دەباتە سەرت و هەموو حیسابێکت لەگەڵدا دەبڕێنێتەوە... ها... ئەوە بۆ بەلاڵەپەتییەوە وەڵامی ئەو یادە مەچەک هەڵماڵیوەت دەدەیتەوە؟! دیارە دەتەوێ پاکانە بۆ بەدبیری و بەدڕەفتارییەکانت بێنیتەوە... دەتەوێ بڵێی، بەڵێ منیش وەکو هەموو مرۆڤێ حەقی ئەوەم هەبووە، جار جارێ جڵەوی سۆز شل کەم و بەکامی دڵ ڕەفتار بکەم!

جا چ کەسێ ئەم حەقەی لێ گرتبووی؟ ها خۆت... بەڵێ خۆت! تا ڕادەیەک حەقت بوو، بەهەزار فرتوفێڵ و درۆ و دەلەسە، داوی سۆزی خۆت بتەنی تا شیرینی بەستەزمانی تێ کەوێ و بیکەیتە نێچیر... حەقت بوو... هەزار پەیمان و سوێندت بۆ خوارد... دڵیت داگیر کرد... سێ ساڵ لەمەوبەر بوو دوا نامەیت

پێ گەیشت... ئەوەندە خوێنتتەوە تا دێر بەدێرت لەبەر کرد، پاشانیش زۆر بێ بەزەییانە سووتاندت و بەخۆڵەمێشەکەی چاوانی خۆتت ڕژت.

ئێستاش بەجوانی وەبیرت دێتەوە کە بۆی نووسیبووی:

– لە خۆم خۆشەویستتر!

وا دەزانم، کاتێ کە ئەم نامەیەم دەگاتە دەستت، من، بەڵێ من، لە دەستی خۆم و تۆ چووم! ئەگەرچی تۆ ئەوەندە دەربەست نیت، بەڵام دوا خەمم، ئەو ساتە پەشۆکاوییەی تۆیە کە بۆ چەن دەقیقەیەک خەم دەخۆیت... منیش بۆ خۆم بێ دەربەستم، دڵنیا بە بۆ سەلماندنی بێ دەربەستیم، نەک وەک قسە و بەس! بەڵکو وەک کار، دەبینی بەئەوپەڕی خۆشەویستییەوە دنیام جێ هێشتووە... بێ ئەوەی (تۆ) بەهۆی ئەم خۆکوژییەی خۆم بزانم! نەخێر کاتێ بۆ دوا جار چاو لەیەک دەنێم دڵنیا بە، لە نێو دیدەکانمدا قەد و باڵات دەگوشمە ڕۆحمەوە... هەروەکو ئەو جارەی بۆ یەکەم جار بینیتم دەتهێنمە نێو چاوانمەوە:

کەڵەگەتێکی شەرمنۆک و کەمدوو، گەنم ڕەنگ، ڕەفتاری لادێیی ئاسا، (غیرە) تێکەڵی خوێنی بووە و (غیرە) لە سێبەری خۆیشی دەکات! پارچەیەک ئاگرە، چاوەکانی پشکۆ ئاسا، بۆ خۆشەویستی، ڕوخساری ڕۆشن کردبووەوە، بێ دەربەست،



حەز بەفێربوون دەکات، گلەییی زۆرە، نەفرەت لە چاوانییەوە دادەبارێنێتە سەر بێ فەڕ و خۆپەرستانی نەتەوەکەی! بەخوێڕی و هەلپەرستیان دەزانێ...

بەڵێ گەنجێکی شەرمنۆک و کەمدوو، هەموو سەرمایەی، سۆز و خۆشەویستییە و دڵی داگیر کردم... دەمپەرست، تا ئەم دێرانەش دەنووسم هەر دەتپەرستم عەزیزم!

دوێنێ ئێوارە، زۆر بەوردی گوێم بۆ قسەکانت هەڵخستبوو کە وتت: (شیرین... بمبوورە... ترسنۆک نیم، لەبەر خاتری تۆ لەبەر خۆشەویشتیی تۆ... دەمەوێ بڵێم پەشیمانم، چونکە هەرگیز ناتوانم بەختەوەرت کەم! بمبوورە، هەرچەندە بیری لێ دەکەمەوە:

کەسێکی چەوساوە و بێدەنگ، دەوروبەری بەهەزاران داو تەنرابێ، دەربەدەر و ماڵوێران دەکرێ... ناچاریش دەکرێ قەناعەت بەخۆی بێنێ کە ئەمانەی لە پێناوی مرۆڤایەتی و یەکێتی و سۆسیالیستیا پێ دەکرێ... چۆن دەتوانێ لە خەونیشدا قەناعەت بەخۆی بێنێ، کە ببێتە خاوەن خێزان و لەگەڵ هاوسەریدا بەهێمنییەوە بژین و تۆوی بەختەوەری بۆ نەوەکانیان بڕوێنن – هەرچەندە سەیری ئەم کارە دەکەم وەک ئەوە دێتە بەرچاوم کە گەوجێکی بێ فەڕ لە جیهانی سێیەمدا و

لە ژێر سایەی ڕژێمی ڕەگەزپەرستیا، داوای دیموکراتییەت بکا!)

شیرین... بمبوورە، دەشێ بۆ یەکەم جار، ببیستی و ببینی کەسێ لەبەر خۆشەویستی، خۆشەویستی خۆی جێ بێڵێ! دەزانی... دەبینی... زۆربەی گەنج و پیاوانمان، تاقە پاکانەی بێ جووڵەیی و خەمساردییان ئەوەیە دەڵێن:

(ژن و ماڵ و مناڵمان هەیە! ئێمە خۆمان دەتوانین بەرگری لە برسیەتی و دەربەدەری و ڕووتی بکەین... بەڵام ئەو ژن و ماڵ و مناڵانەمان گوناهیان چییە؟!)

شیرین گیان:

دەبینی ژن و مناڵ بووەتە داردەسێ... لە لایەکەوە ناحەقیان نییە، بەڵام هەرچی بەدکارییەک دەبینی، گەر لێی ورد بیتەوە هەموو تەنیا لەبەر (نان و ماڵ و مناڵە) درۆ لەگەڵ خۆیاندا دەکەن و بەسەرشۆڕی قایل دەبن! گەر یاخیش بن، ئەوا برسیەتی و دەربەدەرییان بۆ جێ دێڵێ، ئیتر لاڕێگرتن و بێ پەروەردەیی و لاساری دەبێتە میراتی ئەو خانەوادەیە، دووریش نییە، ڕەوشت نوێنێ بەکەسی یاخی بڵێ:

«جا کەسێ نەتوانێ خزمەتی ماڵ و مناڵی خۆی بکات، چۆن



باوەڕی پێ دەکرێ گەر لافی خزمەتی نەتەوە لێ بدات!»

عەزیزم:

دوێنێ وشە بریندارەکانت باوەشێنی ئاگری دەروونمی دەکرد... دەمزانی ڕاستگۆییت و تەنها خۆشەویستیی ڕاستەقینە هاندەری بڕیارەکەت وا بەجۆرە سۆزێکی خواوەدانە دەتوت:

«شیرین... ڕەنگە ئێستا لە سۆزی دایک و باوک نەگەین وا کوێرانە تانە و توانج لە خەڵکی دەگرین – ئەوسا نازانم وەکو ئێستا دەتوانین بڵێین (نەء) و سوور بین لەسەر وشەی (نەء) و لە پای قەنارەشدا هەر بڵێین (نەء) نازانم ئەوسا منیش دەتوانم وەک حەمەی هاوڕێم بڵێم:

«ئاسانە... دەتوانم بەدزی و سەرشۆڕی و گەوادی هۆشیاری کوڕم بکەمە پیاوێکی زانا و بینێرمە دەرەوەی وڵات و دواڕۆژی بۆ مسۆگەر بکەم».

بەڵام لەبەرئەوەی زۆرم خۆش دەوێ و خۆمم زیاتر خۆش دەوێ، دەمەوێ لە هەموو زانستێ چاکتر و کاریگەرتر حاڵی کەم و تێی بگات (ژیان یانی سەربەرزی) باوەڕیش ناکەم کەسانی ستەمدیدە و ڕەنج بەخەسار نەچوو، بتوانن چێژ لە

ژیان و مردن وەرگرن...

چێژی ژیان ئەوەندە بەتەمەن نییە – چێژی ڕاستەقینە و تێربوون لە مردندایە! جۆری ژیان و هەوڵدان بۆ چاکتر، تەنیا مەبەست هەڵبژاردنی جۆری مردنە... واتە ژیان مەشقە بۆ فێربوون و ڕێز لە مەرگ گرتن... کەسایەتیی چ کەسێ تەواو نییە و نابێ تا لە ژیاندا بێ... بەڵکو جۆری مەرگ، کەسایەتیی کەسەکە دەردەخات!

خۆشەویستم:

لە ڕاستیدا دوێنێ زۆر بەزەحمەت لەم وشانەت دەگەیشتم، بەڵام دەمزانی بەئەوپەڕی ڕاستگۆییی دەدوێیت... بۆیە خۆم گەلێ شتم لێ هەڵکراند کردمە ئەزموون و ئاکامی ئەم ئەزموونەش پاش خوێندنەوەی ئەم نامەیەم بۆت دەردەکەوێ...

جگە لەوەی هەر لەمێژە، لە وەتەی خۆمم ناسیوە، لە ڕووی پرسیارێکی زەقی بێ وەڵامدا دۆش داماوم. ئەویش تەنیا پرسیاری من نییە، بەڵکو پرسیاری بەشێکی تەواوی کەسانی (خۆناسە) ئایا ژیان ئەوە دەهێنی مرۆ تیایدا بژیت؟ گەلێ بەدووی وەڵامی ئەم پرسیارە سەختەدا گەڕام چ وەڵامێکم دەس نەکەوت، (ئێستایش) دەڵێم:



ژیانێ بەکامی دڵ نەبێ، مانای نییە، هەر لە هەمان کاتیشدا پێکەنینم بەم قسەیەی خۆم دێتەوە! کامی دڵی چی! بۆ من بۆ ئەوە هەم بەکامی دڵ ژیان بگوزەرێنم... گەر وابێ ئەوا خۆمم زۆر بەسووکی دێتە پێش چاو. هەست دەکەم ژیان – بەتایبەتی ئەم ژیانەی ئێمە – موختەبەرە و ئێمەیش مشکین!... مشکێ لە نێو قەفەسی (زاناکان)... پێم وابوو گەر هەوڵی ئەوە بدەم جۆری ژیان بگۆڕم و لە دنیای ڕۆتین دوور کەومەوە، ڕەنگ بێ دیدم بۆ ژیان بگۆڕێت، هەر بۆیە چەند جارێکیش داوام لێ کردی لەگەڵتا بم و بەشداری کەم، کەچی هەر دەتوت نەکەی! دوایی هەزار قسە و قسەڵۆکت بۆ هەڵدەبەستن... نازانی – ئێمە – ئەوەندەی قسە کارمان تێ دەکات، گوللە ئەو کارەمان لێ ناکات! من دڵنیام لە تۆ... بەڵام خەڵکەکە!!

ئازیز... خۆشەویست... لە بێ سەروبەریی ئەم نامەیەم ببوورە... هەرگیز ناتوانم جگە لە ڕاستگۆیی و سەربەرزی کەسێ بکەمە هاوسەرم... وا دەزانم لە مەرگ ڕاستگۆتر و سەربەرزترم نەدۆزیوەتەوە.

بۆ دوا جار سوپاست دەکەم فێری ئەوەت کردم نەترسم، دڵنیا بە ناترسم... دەزانم دەگەشێیتەوە، گەر بۆت دەرکەوێ زاڵ بوومەتە سەر هەموو ترسێ... خۆشەویستم، ئەوا لە خۆم

ناترسم!

لە مەرگیشدا دڵسۆزت شیرین

کە نامەکەی شیرینت وەدەست گەیشت، یەکەم جار نەتتوانی بیخوێنیتەوە... ڕاستتر تەنیا بەچاو دەتخوێندەوە... دووبارە و سێ بارەت کردەوە، هەوڵت دەدا بەوردی وشەکانی شی کەیتەوە، گەلێ سەرت لە بێ سەروبەریی نامەکە تێکچوو... هەستت دەکرد شیرین بەپێچەوانەوە لە قسەکانت گەیشتووە... توانای ئەوەت نەبوو ببیستی کە چۆن و بەچ جۆرێ دەستی چووەتە خۆی... چەند ڕۆژێ لە ماڵێدا دەرنەچوویتە دەرێ، هەرکە لە خەو وەئاگا دەهاتیتەوە، حەبێکی دیی ڤالیۆمت قوت دەدا... توانای ئەوەت نەبوو، لە ڕووی دادگای ویژدانتا خۆت ڕاگری و لە یەک کاتدا خۆت بەتاوانبار و بێ تاوان بخەیتە ڕوو... چەند ڕۆژێ لە ماڵێدا دەرنەچوویتە دەرێ، پاشان خۆتت فێری خواردنەوە کرد.

گەلێ شتت لە بیر دەچووەوە... یەکەم کەسی بارەکان بوویت... لە نیوەشەویشدا دوا کەس بوویت بارت جێ دەهێشت! لەو ماوەیەدا هەندێ لە هاوڕێیەکانت گیران، یەک دووانیان لە ژێر داردا گیانیان دەرنەکرد... جەلیلیش کە بەقسە هیچی نەهێشتبووەوە، کەسی بەهیچ نەدەزانی و هەمیشە بەگلەیی بوو



– تەنیا بەدانپیانان نەوەستا، بەڵکو لەگەڵ سیخوڕەکان سواری لاندرۆڤەرێ بووبوو، یەکە یەکە ماڵی هاوڕێیەکانتی دەستنیشان دەکرد! ڕێککەوت وابوو (تۆ) بەرنەکەوی... بەهارە ڕۆژێکی فێنک بوو هەر لە نیوەڕۆوە دەستت بەخواردنەوە کردبوو، گەلێ مەست بووی، بۆ یەکەم جار چوویتە گۆڕستان بەناونیشانی کێڵەکان قەبرەکەی شیرینت دۆزییەوە، وڕێنە و فرمێسکت تێکەڵ بوون... هێزت تیا نەما، لە تەنیشتی گۆڕەکەدا کسکۆڵەت کرد گاه ئەستێرەت دەژمارد و گاه خەمی هەڵچووت لە شێوەی فرمێسک دائەبارانە سەر قەبرەکە... بەرەبەیان وەئاگا هاتیتە و... گەلێ شەرمت لە خۆت کرد، وەک تارمایی بەنێو پێچی کۆڵانەکاندا بەرەو ماڵی خۆتان هەنگاوت نا... هێشتا نەگەیشتبوویتە سەر کۆڵانەکەتان، دیمەنێکی نائاسایی ڕای گرتی، تاقیکردنەوەی چەند ساڵەت فێری کردبووی کە چۆن پیاوی چاک و خراپ بەجووڵە و سەرنج لە یەکدی جیا کەیتەوە... بەئاسپایی بەرەو دواوە کشایتەوە... بۆ نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە، هەموو شتێکت بۆ دەرکەوت... فریای ئەوە نەکەوتی چاوت بەدایکت بکەوێ و خواحافیزیی لێ بکەیت... جارێکی دی ئەو (کلۆڵەت) سپاردە تەنیایی و بازووە کەم هێزەکانی خۆی... بەرەو چیا کەوتیتە ڕێ...

لە ڕێدا هەر خەمی ئەوەت هەبوو ئەمجارەیان چ جۆرە ڕەوشتێ بکەیتە هاوسەنگی بیروباوەڕت... چونکە دەتزانی میللەتەکەت بەقەد ئەوەی سەیری ڕەفتار و ڕەوشت دەکات، ئەوەندە لە خەمی ئایدیۆلۆژیادا نییە... خەمی ئەوەت هەبوو (دیسانەوە پاش ئاشبەتاڵ و ئەم تێهەڵچوونە هەر عەشیرەتبازی و چاوپۆشین و ئاغایەتی لە گۆڕدا بێ... دیسانەوە ڕێ لە ڕۆشنبیران گرتن دەکەنە ئامانج! یا وەک دەڵێن: چەشە و تڕە پەیمان لە خشتەمان دەباتەوە!).

گەیشتیتە چیا... هەمان ڕەش و ڕووتی پازدە بیستساڵی لەمەوبەری نەتەوەکەت، بەهەمان دڵسۆزی و لەخۆبووردنەوە لە کاردان... دەست و پێ و نەفەرەکان، بەورە و دڵسۆزن، تێگەیشتووترن لە جاران... بەرەو ژوور، ژوورتر ملی ڕێت گرتە بەر... نەخێر...

هەیهۆ ... هەیهۆ... هەمان دامودەزگا کۆنەکان... هەمان ڕوخسارە بزەئامێزی چاپلووسی و هەمان گەوج و ئەحمەق، بەهەمان ڕەفتاری ئاغایەتیی جاری جارانەوە (شۆڕشگێڕن) بەڵام هەریەکە و لە بەرگێکی ڕازاوە بەدەیان دروشمی بریقەداری کاڵفام خەڵەتێن، خۆیان خستووەتە ڕوو ئەمجارەشیان دوودڵ بوویت، نائومێدی بەرچاوتی گرتەوە:



گەلێ خەمی ئەو هاوڕێیانەی شارت بوو کە چۆن – بەستەزمانانە – لە هیچە دڵی یەکدی عاجز دەکەن و لە یەکدی دەڕەنجێن، لەبەرئەوەی ئەمیان دەڵێ ئەو ڕاستە و ئەویانیش دەڵێ ئەم ڕاستە. خۆزیات دەخواست ئەوانیش تۆ ئاسا بێنە چیا و ئەم پاشاگەردانییە ببینن کە تەنیا (مەرگی ڕژێمی دوژمن) میللەت هەموویان بەگسک دەماڵێ، دڵت بەمیللەت سووتا و پشتت بەهەمان میللەتی لەخشتەبراو، ئەستوورتر بووەوە.

زانیت، بۆت دەرکەوت، ئێستا ئەمڕۆ، میللەتەکەت لە یەک کاتدا بریندارە و لەخۆ چووە... هەموو لەشی خوێن دادەچۆڕێنێ... بەستەمت زانی پشتی تێ کەیت و بۆ ئەوروپا تێی تەقێنی و لە نێو لنگی ئافرەتاندا خەون بەمفاوەزاتەوە ببینی. لە هەمان کاتیشدا بەکەرایەتیت دەزانی لە یەک کاتدا بۆ تیماری ئەم دوو دەردە تێ کۆشیت... خۆتت هەڵبژارد بەشداری کەیت لەوەی (ئەم لەخۆ چووە وەئاگا بێنیتەوە... با، تیماری خوێنڕێژییەکەی بۆ کەسانی دی و قۆناغێکی دی بمێنێتەوە... ئەم ڕەفتارەت بەدڵی چ کەسێکی (مەسئوول) نەبوو، دەیان داویان بۆ تەنیت و هەزاران ڕاپۆرتیان لەسەر نووسیت... ئەنجام... ئەوەیە وا خۆت دەبینی کە ئێستا لە کوێدایت.

ئەوە فرمێسک لە چاوانتەوە دێنە خوارێ... شەرمە... ئێستا گەر کەسێ بەم شێوەیە بتبینێ، دەڵێ ئەوا لە ترسی مردن دەگرییێت! ئەوە خۆ چاوەڕێکردنەکەت درێژەی کێشا... دایکت هەر نەهات... بەمەزەنەی خۆت (ئێستا) بووەتە شەو، خۆ ئاسمانیشت لێوە دیار نییە... چاکتر وایە لە چاوەڕێکردنی دایکت بێ ئومێد بیت... لە ناخیشەوە حەز دەکەی بۆ دوا جار نەیبینی... ئەمەش هەر لەبەر خاتری دایکتە... تاقیکردنەوە بۆی سەلماندوویت کە بیستن هەرچەندە کاریگەر بێت ناگاتە هەزاریەکی بینین... چاکترە گەر دایکت ببیستێ کوڕەکەی کوژراوە، لەوەی کە بێت و بتبینێ و یەکە یەکە ساتەکان بژمێرێ بەهەست ساتی گیان دەرچوونت بێتە بەرچاوی!

ئەوا سەرتاسەری تەمەنت – ئەمجارە – بە تێکەڵ و پێکەڵی بەبەرچاوتەوە تێ دەپەڕێ؟ بۆ وا بەپەلە هەڵسایتە سەرپێ و بەتووڕەییەوە دەست بۆ ئەڵقەکانی زنجیرەکەت دەبەی؟ ڕەنگە مەبەستت بێ، وشەیەک، دێڕێک لەم ژوورەدا بۆ یادگار جێ هێڵی؟ ئەوە خۆ بەخەتی زل و رووپێوی دیوارەکەی لای چەپت بەوشەی (سەگوەڕ) دەستنیشان کرد! خۆ هەڵکۆڵینی ئەم وشەیە، بەم پان و پۆڕییە چەند سەعاتێکی تەمەنتی دەوێ! ئا... خۆ ئەوە شێتانە و بەپەلە جێی پیتەکان لەسەر دیوارەکەدا



هەڵدەکۆڵێ و بەرقەوە، زیاتر دەستت دادەگری، بەرەو ناخی دیوارە کۆنکریتییەکە ئەڵقەی زنجیرەکەت دادەخزێنی...

سێ چوار سەعاتە خەریکیت و هێشتا پیتی (ر)ێی وشەکەت بەتەواوی هەڵنەکۆڵیوە، وا دەنگی پێی پۆستاڵ لە پێیان بەرەو گوێت دێ... ئەوە بەپەلە، بەهەموو هێزێکتەوە گوڕت داوەتە بەر خۆت... ئەوە ئاگات لە جیڕەی کردنەوەی دەرگا ئاسنەکەی ژوورەکەت نییە؟ هەر لەگەڵ هەناسەی ئۆخەی ئامێزی کارەکەت دوو یاساوڵ باسکیان گرتی... ئەوە خۆ بەڕووی یاساوڵەکاندا پێ دەکەنیت... ئەملا و ئەولایان لێ گرتووی... ئەوە خۆت ڕادەپسکێنی دوا سەرنجی وشەکەت دەدەی... لە بەردەرگای ژوورەکەتا وەستایت... پڕ بەقەوارەی دیدەکانت بەسەرنجێکی پەلە سەیری ژوورەکەت دەکەی: دیواری لای ڕاستی ژوورەکەت بەخەتێکی نیمچە زل هەر لە یەکەم ڕۆژی نیشتەجێی ئەم ژوورەتدا وشەی سەگوەڕت لێ نووسیوە... دیواری لای چەپی لە دوا تەمەنتا بەم خەتە زلە سەگوەڕێکی گەورەترت لەسەر هەڵکۆڵیوە... دیوارەکانی لای ژوور و خواروویش هەر سەگوەڕە.

بەدوا سەرنج ژوورەکەت پێچایەوە... بێ خەم کەوتیتە ڕێ... میراتیت تەنیا ژوورێکی چکۆڵەی تاریکی پڕ لە سەگوەڕە! ئەوا گوێ بۆ زڕەی زنجیرەکانی دەست و پێت هەڵدەخەیت... ئەوە پێ

دەکەنی... پێکەنینت بەکەسانی نێو ژوورەکانی ئەملا و ئەولای دالانەکەدا دێت، کە بەئاوازی زرەی زنجیرەکەت گاه هەراسان دەبن و گاه خۆزیات پێ دەخوازن...

***

١٩٨٢